# پێشەوای رابوون

بیرەوەرییەکانی

**سەعیدی هومایون**

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

**هاشم سەلیمی**

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**رەسووڵ سوڵتانی**

ئەم کتێبە وەرگێڕدراوی ئەمەی خوارەوەیە:

هاشم سلیمی

پیشوای بیداری

خاطرات سعید همایون

مؤسسه چاپ و نشر ئاراس، اربیل- ۲۰۰٤

- **پێشەوای رابوون/ بیرەوەرییەکانی سەعیدی هومایون**
- **کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: هاشم سەلیمی**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە: رەسووڵ سوڵتانی**
- **نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین**
- **پیتچنین: رێدار جەعفەر**
- **بەرگ: ئاسۆ مامزادە**
- **سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات**
- **ژمارەی سپاردن: (۸۸٤)**
- **نرخ: ۳۰۰۰**
- **چاپی یەکەم: ۲۰۰۷**
- **تیراژ: ۱۰۰۰ دانە**
- **چاپخانە: چاپخانەی دەزگای ئاراس (هەولێر)**

**زنجیرەی کتێب (۲۱۰)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

**ئەم وەرگێڕانە پێشکەش بە هەموو ئەوانەی**

**بە چاوی رێزەوە دەڕواننە کۆماری کوردستان و رێبازە پیرۆزەکەی**

"وەرگێڕ"

**وێرای رێزو سوپاس بۆ رێنوێنییەکانی**

**مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەن زادە**

**و**

**هاوکاریی فەرهاد ئەکبەری و کامیل نەجاری**

"رەسووڵ"

## ژیاننامەی نووسەر

لە ساڵی ١٣٠٢ی هەتاوی لە ئاوایی یەکشەوەی سەربە ناوچەی فەیزوڵڵابەگیی بۆکان لە بنەماڵەیەکی وردەمالیکی لە دایک بووم. باوکم عەبدولڕەحمان بەگی هومایوون کوڕی موئمین بەگی شێرزادە و نەوەی شێرمحەمەدبەگی کوڕی فەیزوڵڵا بەگی بنیاتنەرە و سەروک عەشیرەتی فەیزوڵڵا بەگەو لە تۆرەمەی بداغ سوڵتانە، حاکمی موکریانە. دایکم خدیجەی هومایوون، کچی قازی علی، قازیی شاری مەهابادە.

لەو سەردەمەدا هەردووک بنەماڵەی قازی و فەیزوڵڵا بەگی لە بەناوبانگترین و دەسەڵاتدارترین بنەماڵەکانی موکریان بوون.

هەر لە منداڵیمەوە هەتا ساڵی ١٣٠٩ی هەتاوی لە ئاوایی یەکشەوە ملکی باب و مامەکانم دەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆم ژیاوم ئەو ساڵانە، رۆژێ هەتا شەوگارشەق دەبوو خەریکی هەڵبەزودابەز و قەرەقەرین و گورزێن و تۆپێن دەبووین، کە ئەوکات باو بوون.

ئەوکات بەهۆی منداڵی و کەم تەمەنیم ئاگاداری ئاڵۆزی و چەرمەسەریی رۆژگار نەبووم. ساڵی ١٣٠٩ کە حەوت ساڵانە بووم

باوکم دەیویست لە شاری بۆکان بچمە قوتابخانە بەڵام لەسەر پێشنیاری قازی محەممەدی خاڵم هاتمە مەهاباد و لە قوتابخانەی پەهلەوی فۆرم ناو نوس کرد و دەستم کرد بە خوێندن. لەبەرئەوەی لەگەڵ کەش و هەواوە (فەزا)ی شار و قوتابخانەکانی ئاشنا نەبووم حەزم لە خوێندن نەبوو؛ چونکە لە نێو قوتابییەکاندا هەستم بە نامۆیی دەکرد، هەر رامدەکرد و دەچوومەوە ماڵێ. بە ئەمری خاڵی خوالێخۆشبووم؛ هەموو رۆژێ بەیانی یەکێک لە خزمەتکارەکان بەناوی نەسروڵلا، دەیگەیاندمە قوتابخانە.

پاش ماوەیەک خووم بە هاوپۆلەکانم گرت و ملم لەبەر خوێندن ناو بووم بەیەکێک لە باشترین قوتابییەکان و پلەی یەکەمم بەدەست هێناوە.

ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی پۆلی یەکەمی ناوەندیم تەواوکردو بۆ تێپەڕکردنی پشوی هاوینی گەرامەوە ئاوایی یەکشەوە بۆلای دایک و باوکم. هەر ئەوساڵە لەمانگی خەرماناندا هێزەی هاوپەیمانان (سۆڤیەت، ئینگلیز و ئەمریکا) هێرشیان کردەسەر ئێران و بە تایبەتی خەڵکی کوردستان تەواو گۆڕا. خەڵک لەگەڵ هاتنی هێزە بیانییەکان و هەڵوەشانەوەی حکوومەتی پاشایەتی، پێیان نایە دنیایەکی دیکەوە و وەک باڵندەیەک کە لە قەفەز رزگاری بووبێ لەشەققەی باڵیاندا.

هەتا کۆتایی ساڵی ١٣٢٢ لە باوەشی بنەماڵەکەمدا مامەوە و بەپێی داب و نەریتی ئەو دەم لەگەڵ ئامۆزاکانم خەریکی سواری و تفەنگ هاویشتن بووم بەڕۆژ زۆرتر دەچوومە راوە کەروێشک و بەشەویش دەچوومە راوەکەو.

پاییزی ساڵی ١٣٢٠ی.هەتاوی ژمارەیەک لە پیاو ماقووڵان و سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکە بەسەرپەرشتیی قازی محەممەد چوونە سەفەری باکۆ. ئەودەم باوکم لە مەهاباد لە ماڵی خاڵم بوو لەسەر بانگهێشتی بانگهێشتکراوەکان حەوتوویەک میوانی دەوڵەتی سۆڤیەت بوون و لەو ماوەیەدا چووبوونە سەیری سەیرانگاکانی باکۆ و پادگانی نیزامی و ناوەندە دەوڵەتییەکان و زۆر بەگەرمی میوانداریيان لێ کردبوون. میر جەعفەر باقرۆف سەرکۆماری ئازەربایجانیش چاوی بەمیوانەکان کەوتبوو و خۆشحاڵیی خۆی بە هاتنیان دەربڕیبوو. لە گەڕانەوەشدا هێندێ دیارییان وەک رادیۆ پێ دابوون. رادیۆکان دروستکراوی سۆڤیەت بوون و بەپاتریی تەڕ کاریان دەکرد و پاش تەواو بوونی، پاترییەکان دەبوو پڕ بکرێنەوە... باوکم کە هاتەوە یەکێکیشەوە یەکێک لەو رادیۆیانەی لەگەڵ خۆی هێنابۆوە.

چونکە تا ئەوکات کەس رادیۆی نەدیتبوو زۆری سەرنجی خەڵکی ئاوایی و میوانەکانی رادەکێشا.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٢٠ی.هەتاوی حەمە رەشید خانی قادر خانزادە کە یەکێک بوو لە سەرۆک عەشرەتەکانی بانە، شاری بانەی گرت و بەرپرسان و کاربەردەستانی دەوڵەتی شای لەو شارە وەدەرنا و بەڕێوەبردن ناوچەی بانە و دواتر سەقزیشی بەدەستەوەگرت. ئەوکارە لەلایەن عەشیرەتەکانی فەیزوڵلا بەگی و سەرشێوو خوڕخوڕەوە پێشوازیی لێکرا و هاوکاری یەگژیان کرد. ئەحمەد خانی فاروقی لە عەشیرەتی فەیزوڵلا بەگی کە بە نەترسی و بوێری ناوبانگی دەرکردبوو لە ناوچەی سەقزدا بووبە جێگری

حەمەڕەشیدخان. زۆربەی ئەندامانی هۆزەکەشی بە پەیرەوی لەو، لەو ناوچەیەدا هاوکارییان لەگەڵ دەکرد. لەسەرەتای ساڵی ١٣٢٢دا سوپای شا بۆ بەرەنگاریی حەمەڕەشیدخان لە سنەوە بەرەو سەقز وەڕێ کەوت و بەیارمەتیی هۆزی گەڵباخی پاش چەند تێکهەڵچوونێکی خوێناوی چووە نێو سەقزەوە. حەمەڕشید خان بەرەو بانە پاشەکشەی کرد و عەشیرەتەکانی فەیزوڵلابەگییش گەڕانەوە نێو دێهاتەکانیان و چونکە سوپا بە شوێنیانەوەبوو ئەحمەد خانی فاروقی و براکانی و حەسەن خانی فەیزڵلا بەگی (کانی نیاز) و چوار برای و چەندین بنەماڵەی دیکەی فەیزڵلابەگییەکان و بەگەکانی دەوروبەری سەقز بەمەبەستی خۆپاراستن لە هێرشی سوپا و گیرانیان وێڕای ئەندامانی بنەماڵە هاتنە ئاوایی یەکشەوە بۆ ناو موڵکی ئامۆزاکانیان و لەلایەن باوکم و مامەکانمەوە، بەگەرمی پێشوازیان لێ کرا. یەکشەوە کەوتبووە ناوچەی بۆکان و لەدەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی ئینگلیزییەکان بوو بۆیەش سوپای شا بۆی نەبوو بێتە ناوچەی بۆکان. ئەوانەی پەنایان هێنابووە یەکشەوە و ئەو خزم و کەسانەی سەردانیان دەکردن ئەوەندە زۆر بوون کە دەتوانم بڵێم ژمارەی ئاوایی دوو هێندەببوو. ئەم پەنابەرانە بەڕۆژ خەریکی راوو نیشانە گرتن بوون و خۆشیان رادەبوارد. من و ئامۆزاکانم و کوڕە میوانە هاوتەمەنەکانمان هەتا شەوگار شەق دەبوو، خەریکی یاری و گاڵتە بووین. شەوانەش لە میوانخانە و سەربان دادەنیشتین. من هەڵکردنی رادیۆم لە ئەستۆ بوو. ئەوانەی لەوێ بوون بە بیستی هەواڵەکان لە رادیۆ فارسییەکانی ئەوکات ئاگاداری رووداوە

سیاسییەکان دەبوون. پاش ساڵ و خزمەکانمان گەڕانەوە سەرماڵ و حاڵی خۆیان لە ناوچەی‌سەقز و گەلێک بیرەوەریی خۆشیان بە یادگار بردەوە.

لەسەرەتای پۆلی یەکی دواناوەندیدا، هۆگری گۆڤاری کوردیی گەلاوێژ بووم کە لە عێراق دەردەچوو دەکرا و بۆ خەڵکیان دە نارد، لەو رێگەیەوە وردەوردە فێری خوێندنەوەی کوردی بووم. و لەوسەردەمەدا خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی لە لایەن حکوومەتی پاشایەتییەوە. قەدەغە کرابوو. بەڵام من بەهۆی نزیکایەتیم لە قازی محەممەد و لەژێر چاودێریی ئەودا هەستم بە کوردبوونم دەکرد و گۆڤاری گەلاوێژم دەخوێندەوە. ساڵی ۱۳۲۱ کۆمەڵەی ژ. ک لە مەهاباد پێکهات. منیش لە ساڵی ۱۳۲۲ی.هەتاوی بوومە ئەندامی کۆمەڵەی "ژ. ک" و سوێندی وەفاداریم بۆ کوردستان خوارد و بە ناوی خوازراوی "ئاگری" بەڕسمی بوومە ئەندام. ئەوکات قازی محەممەد، بەسەر مەهاباد و خەڵکی مەهاباد رادەگەیشت و خەڵکی مەهاباد و لەوناوچەدا لەهەر چەشنە گیر و گرفتێکیان هەبوایە، دەیان بردە مەحکەمەی قازی محەممەد و سەدری قازی برایی و لەوێ کاک رەحیم لەشکری و رەحیم جەوانمەردی قازی، لە نووسینگەی تایبەتیی قازی محەممەددا خەریکی کار و بەڕێوەبردنی ئەرکەکانم بووم. لە زۆربەی سەفەرەکانی قازی محەممەددا بۆ تەورێز و ناوچەکانی باکووری کوردستان (ورمێ، شاپوور، خۆی و ماکۆ) و تاران لە خزمەتیاندا بووم و کاروباری نووسین و بەڕێوەبردنی فەرمایشاتەکانم لەئەستۆ گرتبوو.

پاش راگەیاندنی کۆماری کوردستان، جگە لەو چاوپێکەوتنانەی کە لە نێوان قازی محەممەد و بەرپرسانی تاقمی دیموکراتی ئازەربایجاندا دەکرا، بۆ بەڕێوەبردنی هێندێ کاروباری غەیرە سیاسی و گەیاندنی پەیامی قازی محەممەد بە بەرێزان سەید جەعفەری پیشەوەری رێبەری فیرقەی دیموکرات و میزرا عەلی شەبستەری سەرۆکی پەرلەمانی میللیی ئازەربایجان؛ من دەنێردرام، بۆ ئەوەی پێشنیار و پەیامەکانی قازی محەممەدیان پێ رابگەیەنم و وەڵامیان لێوەرگرمەوە. چوونم بۆلای پێشەوەری زۆر ئاسان بوو، چونکە شتەکانم بە فارسی پێ رادەگەیاند و ئەویش بە رووخۆشی وبە رێزەوە بە فارسی وەڵام دەدامەوە، بەڵام بۆ لای شەبستەری چونکە بەزمانی تورکی قسەی دەکرد و منیش زمانی تورکیم باش نەدەزانی هەتا دەگەیشتمە نووسینگەکەی بەردەوام قسەکانم لەزەینمدا بە تورکی دێنا و دەبردن و ساغم دەکردنەوە و کە دەگەیشتمێ، زۆر جاران لە بیرم دەچوونەوە و بە فارسی قسەم دەکرد و جەنابی شەبستەرییش هەروا بە تورکی وەڵامی دەدامەوە، بۆیە چوون بۆلای ئەو بەلامەوە گران بوو.

رۆژی یەکەمی بەفرانباری ١٣٢٥ی.هەتاوی- قازی محەممەد حەمە و حوسێن خانی سەیفی قازی و حاجی بابەشێخی سەیادەت و ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی کوردستان گیران و بەندکران. منیش وێڕای ترس و نیگەرانیم لە رژێمی شا لە مەهاباد مامەوە و بەرۆژ هاتووچۆی ماڵە خاڵوانم دەکرد و ئەگەر کارێکیان پێم هەبوایە جێبەجێم دەکرد و زۆر جاریش دەچوومە ئەو شوێنەی خاڵوانمی تێدا

بەندکرابوو لە مەودای پەنجا مەتردا خاڵۆکانم دەدیت و ئەوان لە ڕێگەی ئەفسەری نیگابانەوە داخوازییەکانیان پێدەگەیاندم.

بەیانی ڕۆژی١٠ی خاکە لێوەی ساڵی ١٣٢٦هەتاوی بەشین و ڕۆڕۆی دایکم لەخەو هەڵسام و بەوپەڕی داخ و کەسەرەوە هەواڵی شەهیدکردنی خاڵەکانم پێ گەیشت وێڕای ئەوەی حکوومەت نیزامی بوو (هاتوچۆ قەدەغە بوو) دەگەڵ دایکم لە تاریک ورووی بەیانیدا هەستام و بە کووچە وکۆلاناندا چووینە ماڵی خاڵۆیانم بۆلای ماڵ و منداڵەکانیان.

سەعیدی هومایون

پاش چەند ڕۆژان، منیش گیرام و لە شارەوانیی مەهابادا دەستبەسەر کرام و دوومانگ لەزیندان دا مامەوە. پاشان بە(کەفیل) بەربووم و لە ترسی ئازار و ئەشکەنجەی مەئموران کە جاروبار

و بێ هیچ بیانوویەک یەخەی خەڵکیان دەگرت، بۆیەگەڕامەوە بۆ یەکشەوە. هێندەی پێنەچوو لە لایەن دادگای پێداچوونەوە (تجدید نظر) بانگ کرامەوە. بەڵام لەترسی گیرانم نەچوومەوە و لە رێگەی دەلاڵێکەوە حوکمی بێ تاوانیم لەدادگا وەرگرت و گەڕامەوە مەهاباد.

چەندساڵێک لە مەهاباد و یەکشەوە بووم و ساڵی ١٣٢٧ی هەتاوی لەگەڵ کچە مامێکی باوکم لە یەکشەوە ژیانی هاوسەریمان پێکەوەنا و سەرەتای ساڵی ١٣٢٨ی.هەتاوی لەسەر پێشنیاری خاڵۆژنەکانم بەمەبەستی یارمەتی و جێبەجێکردنی کاروباری بنەماڵەکەیان هاتمە مەهاباد و تائێستاش هەرلەوێم. (هەڵبەت ئێستا نووسەری ئەم دێڕانە بەداخەوە کۆچی دوایی کردووە و نەماوە. وەرگێڕ)

پاش گەڕانەوەم لە یەکشەوەڕا بۆ مەهاباد، ماوەی چەند ساڵێک بەکاروباری بنەماڵەی قازییەکان راگەیشتم و ساڵی ١٣٤٧هەتاوی لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شاردا بەشداریم کرد و بوومە ئەندامی ئەنجومەنی شاری مەهاباد و ماوەی چوار ساڵ ئەندام و جێگیری سەرۆکی ئەنجوومەنی شار بووم. لە دەورەی دواییشدا بەشداریم کردەوە و بە دەنگ و خۆشەویستیی خەڵک لە ساڵی ١٣٥١ەوە هەتا ١٣٥٥ سەرۆکی ئەنجوومەنی شاری مەهاباد بووم و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هاوکاریی شارەدار و خزمەتی خەڵکم دەکرد. ئەوەش بە یەکێک لە شانازییەکانم دەزانم.

لە تێکهەڵچونەکانی نێوان پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات و مەئموورانی رژێم لە جۆزەردانی ١٣٦٠ی.هەتاویدا لە مەهاباد

ژمارەیەکی زۆر لەهەردووک لا کوژران. بێ هیچ بەڵگە و هۆیەک و تەنیا بۆ چاوترسێن کردنی خەڵکی شار گیرام و بۆ شاری "رامغان" دوور خرامەوە. چوارمەلای ئایینیش وێڕای بنەماڵەکانیان دەگەڵ دوورخراوەکانی دامغان بوون. لەو ماوەیەدا بە پێچەوانەی بۆچوونی رژێم لەلایەن خەڵکی شاری دامغانەوە ڕێزێکی زۆرم لێ گیرا. ئەوانە زۆر بەرێزەوە رەفتاریان لەگەڵ دەکردین و وەک میوان چاویان لێدەکردین و رێزیان لێدەگرتین.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٦٢ی.هەتاوی دا بۆ دادگای پێداچوونەوەی (تجدید نظر) شاری سنە بانگ کراین بە سواری ئۆتومبێلێک بەرەو سنە وەڕێ کەوتین و هەر ئەو رۆژە گەیشتینە دادگا و چونکە بەڕاستی بێ تاوان بووین، هەمووومان بێ تاوان ناسراین و بڕیاری ئازادی و گەڕانەوەمان بۆ شاری مەهاباد وەرگرت و بە شادمانییەوە بەرەو دامغان وەڕێکەوتینەوە. بیرەوەرییەکی شیرنی ئەو رۆژە ئەوەیە کە لەگەڕانەوەدا کە شەو بەرێگاوە بووین لە بیابانێکی نێوان سمنان و دامغان بۆ کردنی نوێژی بەیانی دابەزیین و چونکە ئاو نەبوو پاش تەیەمموم بە خۆڵ؛ نوێژی بەیانیمان بەجەماعەت و بەپێش نوێژیی مامۆستا مەلا عەولای ئەهمدیان، بەجێ هێنا و بە دڵخۆشی و خۆشحاڵییەوە گەڕاینەوە شاری دامغان. پاش ئەوەی چووینە فەرمانداریی (قایمقامی) دامغان و پێشاندانی حوکمی تاوانیمان، هەر لەوێوە تەلەفۆنمان کرد بۆ دۆستێکی مەهابادمان کە لە تاران گەراجدار بوو و داوامان لێکرد کاری هێنانەوەی کەلو پەلەکانمان بۆ ڕێکخا. پاش دوو رۆژان ماشێنەکان هاتن و کەلوپەلی هەرسێ بنەماڵەمان

لێ بارکردن و لە دامغانەوە بەرەو مەهابادی زێڕ و نیشتمانمان گەڕاینەوە. بنەماڵەی بۆکانییش لەوێ بوون. پاشان ئەوانەی کارمەند بوون گەڕانەوە سەرکارەکانیان و ئەوانی دیکەش چوونەوە سەر کار و کاسبی پێشوویان. بیرەوەرییەکانی خەڵکی دامغان و سمنان و شاهروود لەبیرناچنەوە. ئێستاش پێم ناوەتە هەشتا ساڵی و بڕای پشووی رۆژانە خەریکی خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی و سیاسیم.

گەورەیی و لوتفی خەڵکی کوردستان، بەتایبەت خەڵکی مەهاباد، بە درێژایی ساڵە پڕهەوراز و نشێوەکانی ژانم بوونەتە هۆی دڵگەرمیی خۆم و بنەماڵەم و ورەیان پێداوم هیچ کات موحیبەت و فیداکاری و جوامێرییەکانی خەڵکی وڵاتەکەمم لە بیرناچێتەوە و چی وا شک نابەم پێشکەشیان بکەم، بێجگە لەو وتە شیرنەی سەعدی:

**مقدور من سایست کە در پایت امنکنم**
**گر زانکە التفات بەاین مختیر کنی**

دووی رێبەندانی هەزار و سێ سەد و هەشتا و دووی هەتاوی

١٣٨٢/١١/٢

سەعیدی هومایون

## "پێشەوای رابوون"

**پێشەکی**

لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان و سووڕی دەوران؛ لەنێو جەماوەردا لەهەر تیرە و نەژادێک دا، جاروبار مرۆڤگەلێک دێنە دنیا کە کردەوە و بیروڕایان؛ رەوشت و ئاکاریان شوێنەوارێکی دیار و هەمیشەیی بەجێ دەهێڵن و گەلێک قوتابی و رێبوار پەروەردە دەکەن بۆ ئەوەی دادپەروەری، ئازادی و دیموکراسی کە بە درێژایی مێژوو زەین و گیانی بیرمەندان و رێبەرانی هەڵکەوتەی کۆمەڵگای بەخۆوە خەریک کردووە وەدی بێنن.

بەم جۆرەیە کە زۆر دواتر؛ دەروون ناسان و کۆمەڵناسان سەرنج دەدەنە شوێن دانەری و کارلێکەری هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی ئەو کەسانە و توانایی بەڕێوەبەریی، ئاستی بەرپرسیارەتی وەرگرتن و باوەڕی ئایدۆلۆژیکی و بەرهەمە زیندووەکانی ئەم کەسایەتییانە لەکاتی بەرپرسیاریەتییاندا لەو ماوە زەمەنیەدا دەخەنە بەر توێژینەوە بۆ ئەوەی رەسەن و ناڕەسەن لێکهەڵاوێرن و ئەو دەسکەوتە پربەهایەی وەک وانە و ئەزموون لەو گەورە و کەڵە پیاوانەیان وەرگرتووە بە نەوەکانی داهاتوو بسپێرن

بێگومان قازی محەممەد کەسایەتی فەرهەنگی و ساسیی نەتەوەی کورد یەکێکە لە کەڵە پیاوانی "ئێران" کە لەژێر کاریگەریی هەلومەرجی فەرهەنگی و زانستی بنەماڵەکەی "چونکە هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی زانای ئایینی بوون"

زوڵم و ستەمی دەسڵاتدارانی رژێمی ئەوکات لەلایەک و خەم و پەژارەی دواکەوتوویی گەلەکەی لەلایەکی دیکەوە؛ وانەی مرۆڤدۆستیی فێرکردبوو و ببووە هۆی ورووژانی هەست و رۆحی ناسکی. ئەویندار و بێ ئۆقرە، راپەڕیوو خۆڕاگر، سەری هەڵداو بە پەیڕەوی کردن لەڕێبەران و شۆڕشگێڕانی (مێژووی گەلەکەی) دەستی کرد بە دەربڕینی بیرۆکەی مرۆیی و رزگاریخوازیی خۆی سروودی رابوون و هوشیاریی چڕی و هەتا دوایین هەناسە ئەم رێگە پڕ لە هەوراز و نشێوەی بڕی و "حەللاج" ئاسا چووە پای سێدارە.

دوایین چرکە ساتەکانی ژیانی پڕ لە شانازی و ئەم وتە پڕ بایەخەی کە وتی: "لەپاش من هەزاران رۆڵەی ئەم نیشتمانە درێژەپێدەری رێگا و ئامانجم دەبن" ئەم وتەیەی ئاندرێ مالرۆی فەڕنسی وەبیر دەهێنێتەوە کە گوتی: "مرۆڤ ئەگەر نەتوانێ گیانی لە پێناو ئارمانجەکەیدا بەخت بکا؛ ئیدی مەزنایەتییەکەی لەچیدایە؟"

بەر لەوەی بچمە نێو باسەکەمەوە؛ ئەو خاڵە وەبیر دەهێنمەوە؛ بەهۆی ئەوەی کە منی (نووسەر) خزمایەتیەکی نزیکم لەگەڵ بنەماڵەی قازییەکانی مەهاباد هەیە؛ بە پێویستی دەزانم لە سەرەتادا بە کورتی بنەماڵەکەیان بناسێنم. بە سەرنجدان لەوەی کە نووسینەوەی بیرەوەری بەپێی داب و نەریتی گشتیی دیرۆک نووسینی بریتی‌یە لە: گێڕانەوەی رووداو و کارەسات گەلێک کە

لەژیانی نووسیندا روویان داوە کاریگەری و شوێنی قووڵیان لەسەر فیکروو، بیری کەسایەتیی ئەو بەجێهێشتووە. هەر بۆیە گێڕانەوەی ئەو بیرەوەرییانەش دەکەوێتە ژێر کارتێکەریی ئەو رووداوانەی کە لە ژیانی بنەماڵەیی، کۆمەڵایەتی و سیاسیی رێبەری کوردستان، قازی محەممەد دا پێشهاتوون.

کەوابوو هۆی ئەم راکردنە لە ئاستەنگی بیرەوەرییەکان ئەوەیە کە سەردەمی لاوێتیم بەهۆی پەیوەندیی چڕو پڕی بنەماڵەییم و هەروەها بەشخوراوی و ئەو رووداوانەی بەسەر خودی قازی محەممەددا هاتوون، سێبەریان خستۆتە سەر بیرەوەرییەکانی من و بەشێکی گرینگیان داگیر کردووە.

ئێستاش بۆ روون کردنەوە و تێگەیاندنی خوێنەرانی بەرێز و تیشک خستنە سەر ژیانی قازی محەممەد؛ رووداوەکانی ژیانی بەرێزیان دەکەینە سێ بەش:

بەشی یەکەم: لەسەرەتای ساڵی ١٢٧٩هەتاوی بەرامبەر/ ١٩٠٠زاینی لە دایکبوون هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی ١٢٩٧/ ١٩١٨

بەشی دووەم: لە ساڵی ١٩١٨ی زایینییەوە، کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە تاخەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی و داگیرکردنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانان لەشەڕی دووهەمی جیهانیدا - ١٩٤١ی- زایینی.

بەشی سێهەم: لە خەرمانانی ١٣٢٠هەتاویەوە تا خاکە لێوەی ١٣٢٦ی.هەتاویەوە- بەرامبەر بە ساڵی ١٩٤١ی.زاینی هەتاویەوە ١٩٤٧ی زایینی/ شەهیدکردنی پێشەوا.

## پێشینەی بنەماڵەیی قازی

بەو پێیەی بەساڵاچوانی تایەفەی قازی دەڵێن یەکەمین بنیاتنەری بنەماڵەی قازی کەسێک بووە بەناوی محەممەد کە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا هاتۆتە موکریان. هێندێ کەس پێیان وایە ئەو تایەفە کوردن لە گورجستانەوە هاتوونەتە ناوچەی موکریان. بەهەر حاڵ، یەکێک لە (تۆرەمەکانی) محەممەد بە ناوی میرزامەحموودی قازی، بۆ یەکەمجار دەبێتە دادوەری شەرعیی ناوچەی موکریان. بەرێزیان کەسێکی زانا و خەت خۆش بووە، چەندین بەرگ قورئانی بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە و بەیادگار بەجێی هێشتووە پاش میرزا مەحموود، کوڕەکانی بەناوی؛ میرزا قاسم و میرزا عەولا و میرزا محەممەد لە ناوچەی موکریاندا بە ناوبانگ بوون. میرزا قاسمی قازی، کوڕێکی هەبووە بەناوی، میرزا ئەحمەد و ئەویش پێنج کوڕی بەناوەکانی؛ قازی وەهاب، حاجی شێخ جەلال، قازی فەتاح، میرزا قاسمی قازی و میرزا لەتیف هەبووەکە لە ناودارانی بنەماڵەی قازی بوون. میرزا قاسمی قازی باپیری قازی محەممەدیش چوار کوڕی هەبووە بە ناوەکانی: قازی عەلی، ئەبولحسەن (سەیفولقوزات)، میرزا عەولا قازی عەسکەر - میرزا عەبدولرەحیم.

(قازی عەلی) ش دوو کوڕی بووە بەناوەکانی، قازی محەممەد و ئەبولقاسمی سەدری قازی. سەیفولقوزاتیش کوڕێکی هەبووە بەناوی حەمەحوسین خانی سەیفی قازی

ژیان و خەباتی ئەو سێ کەسایەتییە لەم کتێبەدا دەخرێتە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوە.

بەشی یەکەم

## سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵی

یازدەی گوڵانی ساڵی ١٢٧٩ی هەتاوی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٠٠ی زایینی لە بنەماڵەی قازی عەلی، لە شاری ساوجبڵاغی موکریان (مەهابادی ئێستا) منداڵێک بەناوی محەممەد، هاتە دنیا کە دواتر بووە سەرچاوەی گەلێک بەرهەم و شوێنەواری گرینگ و لەبیر نەکراوی مێژووی نەتەوەی کورد. قازی عەلی، پاش مەرگی میرزا قاسمی باوکی، پلەوپایەی دادوەریی شەرعیی ساوجبڵاغ و ناوچەی موکریانی گرتە ئەستۆ. ئەو یەکێک بوو لە زانا کەموێنەکانی کوردستان کە لە هەموو زانستە باوەکانی ئەوکات دا شارەزایی هەبوو و لە زانستی ئەستێرە ناسیشدا موتاڵایەکی بەرفرەوانی هەبوو.

بنەماڵەی قازییەکان هەر لە سەرەتاوە جێی رێز و حورمەتی خەڵکی کوردستان بوون. لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان و شارەکانی ئازەربایجان و تارانیشدا، بەناوبانگ و جێی رێز بوون و کاری دادوەری و دادوەریی نێوان خەڵکیان لە ئەستۆ بووە. هەر بۆیەش بە بنەماڵەی قازی ناوبانگیان دەرکردووە، شوێنی بە تەنگ

وەچوونی سکالاکانی خەڵک لەوکاتەدا پێی دەگوترا (مەحکەمەی قازی) مەحکەمەی قازی، بەردەوام پەسیوو پەناگای هەژاران و مەزڵوومان و جێی چارەسەریی گیروگرفت و ناکۆکی یەکانی خەڵکی ناوچەکەبووە.

قازی عەلی، کە ئەوکات بە میرزا عەلی قازی بەناوبانگ بووە سەرەتای خوێندنی لەشاری ساوجبلاغی موکری دەست پێکرد و پاش ماوەیەک بۆ کامل کردن و تەواوکردنی خوێندن و کەڵک وەرگرتن لە مامۆستایانی پسپۆڕ لە دەرەوەی ناوچەی موکریان؛ (بەپێی داب و نەریتی باوی ئەوکات کە خوازیارانی زانست بۆ کەڵک وەرگرتن لەزانیاری مامۆستایانی هەڵکەوتە شاربەشار دەڕۆیشتن) لەگەڵ خەلیل خانی کوڕی شیربەگی فەیزوڵڵا بەگی سەقزی کە ئەویش ماوەیەک لە سابلاغ خەریکی خوێندن بوو بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچنە شاری سنەی ناوەندی کوردستان. ئەم هاوسەفەری و هاوپۆلیە دەبێتە هۆی پتەوتر بوونی دۆستایەتی و نزیکایەتیی زیاتری نێوان میرزا عەلی و خەلیل خانی کوڕی ئاغا شێربەگ.

پاش تەواوکردنی خوێندن هەردووکیان دەگەڕنەوە زێدی خۆیان- خەلیل خان لە ئاوایی سلێمان کەندیی ناوچەی سەقز دەچێتە خزمەتی باوکی و سەبارەت بە چۆنێتی خوێندن و بارودۆخ و وەزعی شاری سنە زانیاری دەدا بە باوکی. هەروەها زۆر باسی تایبەتمەندی زانستی و رەوشت باشیی میرزا عەلی قازی دەکا و ئیزنی لێ دەخوازێ کە گەوهەر تاجی خوشکی بدات بە میرزا عەلی قازی. باوکی ئەو پێشنیارەی لێوەردەگرێ و پاش راوێژ و چاوپێکەوتن بە پێی نەریتی ئەوکات کە هەر دوو بنەماڵەکە لە

بەناوبانگترین بنەماڵەکانی موکریان بوون، قایل دەبن و رێ و رەسمی خوازبێنی و مارەبڕین و زەماوەندەکەی پێک دێنن و گەوهەرتاج خانم کە کیژێکی زۆر هەڵکەوتەبووە، دەبێتە یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی قازی.

ئاغای شێربەگ کە یەکێک بووە لە منداڵانی سەرۆک عەشیرەتی فەیزوڵلابەگی کە رەچەڵەکی بنەماڵەکەی دەچێتەوە سەر حاکمانی بەناوبانگی ناوچەی موکریان، واتە ئەمیر سەیفەدین و ئەمیر سارمەدین و بداغ سوڵتانی موکری کە ساڵیانی ساڵ بەسەر ناوچەی موکریان راگەیشتون و گەلێک خزمەتی بەنرخیان بە ناوچەی ژێردەسەلاتی خۆیان کردووە. ئاوەدان کردنەوەی شاری مەهابادی ئێستا، مزگەوتی جامعی شار و پردی سوور و گەلێک هەوڵی خێرخوازانەی دیکە لەو شوێنەوارە بەنرخانەن کەلە دوای بداغ سوڵتان بەجێ ماون. ئێستاش گۆڕەکەی لە باشووری شاری مەهاباد شوێنی زیارەتی خەڵکی موکریانە. پەیوەندیی خزمایەتیی ئەو دوو بنەماڵەیە دواتر چڕوپڕتر وگەرمتر بوو. تا وای لێهات کچەکەی دیکەی ئاغا شێربەگیش بەناوی زوبێدە خانم درا بە میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات، براگچکەی میرزا عەلی قازی قازی عەلی و گەرهەرتاج خانم پێش قازی محەممەد سێ منداڵی دیکەشیان ببوون، (کچێک بە ناوی فاتیمە و دوو کوڕ بەناوەکانی محەممەد و ئەبولقاسم) کە هەرسێکیان بە ساوایی مردن- چوارەمین منداڵی بنەماڵەی قازی، کچێک بوو بەناوی خەدیجە (دایکی نووسەر) دواتر خودا کورێکی دیکەشی پێدان قازی عەلی ئەو کوڕەشی نێو نا محەممەد و پاش دوو ساڵان، خودا کوڕێکی

دیکەشی پێدان و ناویانا ئەبولقاسم. محەممەد و بەرباسی ئێمە لە حەوت ساڵیەوە لە خزمەتی باوکیدا دەستی کرد بە خوێندن و سەرەتای خوێندنی لەلای باوکی و وانەی کۆتاییشی لە خزمەت زانایانی بە ناو بانگی ئەو کاتی شاری سابلاغ دا تەواو کرد کە لە ژێر چاودێری و پەروەردەی باوکیدا بەهۆی تایبەتمەندیی باشی زانستی و پاک رەوشتی و کەسایەتیی بێ هاوتای خۆی جێی رێز و حورمەت بوو. دوایین منداڵی قازی عەلی و گەوهەر تاج خانم کچێک بوو بەناوی ئامینە. گەورهەر تاج خانمی دایکی قازی محەممەد، ساڵی ١٢٨٩ی هەتاوی بەرامبەر بە ١٩١٠ی زایینی، کۆچی دوایی کرد چەند ساڵ دواتر قازی عەلی بۆ بەرێوەبردن و سەرپەرشتیاری منداڵەکانی ناچار بوو ژن بێنێتەوە و دەگەڵ ئافرەتێکی زۆر بە حورمەت کە کچی بنەماڵەیەکی بەناوبانگ بوو، زەماوەندی کرد. ژنی دووهەمی قازی عەلی، کچی شێخول ئیسلامی حاجی کەند بوو کە ناوی زیبا خانم بوو. کچێکیشی بەناوی فاتیمە لەو ژنە لێ کەوتەوە، پاش مەرگی گەوهەر تاج خانم، شەرافەت خانمی دایکی دوو نەوەکەی خۆی، واتە خەدیجە و ئەوبولقاسم دەباتە یەکشەوە بۆلای خۆی و پەروەردە و سەرپەرشتیی ئەوان لە ئەستۆ دەگرێ.

## - شەڕی یەکەمی جیهانی و کوشتار و تاڵان و بڕۆی خەڵك -

ساڵی ١٩١٤ی.ز شەڕی یەکەمی جیهانی دەست پێ دەکا، ئێران بە تایبەتی ناوچەی موکریانی کوردستان دەبێتەگۆڕەپانی ڕەمبازێن و کوشت و کوشتاری هێزەکانی ڕووس و عوسمانی. خەڵکی ناوچە تووشی گەلێک زەرەر و زیانی ماڵی و گیانی دەبن. بنەماڵەی قاوییش وەکوو زۆربەی خەڵکی ناوچەکە بۆ پاراستنی گیان و ماڵیان شار بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن. لە پێشدا دەچنە ئاوایی یەکشەوە لە پاشان دەچنە ئاوایی سلێمانی لەندی لەناوچەی سەقز کە ملکی مستەفا بەگی، خاڵی لە قازی محەممەد و سەدری قازی بوو. چەند مانگێک لەوێ دەمێننەوە و پاش ئەوەی عوسمانییەکان لە سابلاغ دا دادەمەزرێن هێرش دێننەوە سەر ناوچەکە و عوسمانییەکان ناچار پاشەکشێ دەکەن. دیسان خەڵک لە ترسی گیانی خۆیان ناچاردەبن سابلاغ بەجێ بێڵن و بڕۆن. بنەماڵەی قازی، دەچنە ئاوایی یەکشەوە و پاش ماوەیەک مانەوە لەوێ لەژێر سێبەری ڕێز و دلۆڤانی و حورمەتی ئاغا موئمین بەگ دا دەژین لەبەر نزیک بوونی یەکشەوە لە بۆکان کە لە سەرەڕێی هاتووچۆی ڕووس و عوسمانی شەڕو هەڵاتێن بووە، قازییەکان ناچاردەبن بڕۆن بۆ هێندێ ناوچەی دوورە شەڕ و هێمن. بەشێکیان چوونە دێهاتەکانی "چۆملوو" پاشبلاغ و بەشێکیشیان چوونە ئاوایی سۆلاوکان لە ناوچەی هەوشاری تەکاب، کە مولکی مستەفابەگی خاڵی قازی محەممەد بوو. ئەم کۆچە لە ساڵی ١٢٩٤ی هەتاوی بەرامبەر ساڵی ١٩١٥ی زایینی دابووە و ماوەی سێ ساڵی خایاندوە. بەگشتی کوردستان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا تووشی

گەلێک زەرەروزیانی قەرەبوو هەڵنەگربووە- لە جەنگەی شەڕدا ئەودەمەی عوسمانییەکان سەر دەکەوتن و خەڵک دەبوو نرخی ئەو شەڕ و پێکدادانانە بدەن و بە هۆی بانگەشەی بەشێک لە پیاوانی ئایینی بەناوجیهاد؛ هێندێ لە کوردەکان بەلایەنگری لە ئیسلام و عوسمانییەکان خۆیان لە شەڕوەردەدا و روسەکانیش بە بیانووی لایەنگریی کوردەکان لە عوسمانی خۆیان لە شەڕوەردەدا و روسەکانیش بە بیانووی لایەنگریی کوردەکان لە عوسمانی دەیان کوشتن و تالآنیان دەکردن- بەداخەوە کوردەکانی ئەم بەشە لە هەردووک لاوە تووشی کوشت و کوشتار و تالآن و بڕۆ دەهاتن. بۆ وێنە عوسمانییەکان پاش یەک دووجار تێکشکان و سەرکەوتن لە ناوچە کوردنشینەکاندا حەمە خانی حاکمی بانە کە یەکێک بوو لە ئاغا بەناو بانگەکانی ئەوێ بەتاوانی هاوکاری دەگەڵ رووسەکان گرتیان و لە لێدارەیان دا. لە پاشان حەمە حوسێن خانی سەردار حاکمی ساوجبلآغی موکری (مەهاباد) و سەیفەدین خانی حاکمی شاری سەقز یان گرت و لەشاری مەراغە لە لێدارەیان دان و شەهیدیان کردن. هەروەها خوالێخۆشبوو شێخ بابە سەعیدی بەرزنجە (غەوس ئابادی)، کە یەکێک لە زانایان و شاعیرانی کورد بوو گە لێکیشی مورید هەبوو دەستگیریان کرد و لە ئاوایی کەرێزەی نزیک قاراوای گەورە؛ ملکی خوالێخۆشبوو عیزامەلمولک کە شوێنی دامەزران و مۆڵگەی عوسمانییەکانی ناوچەی بۆکان بوو، شەهیدیان کرد.

ساڵی ١٩١٥ی زایینی رووسەکان ماوەیەک لە شاری سابڵاغ گیرسانەوە و دەگەل هێرشی عوسمانییەکان ناچاربوون شار بەجێ

بهێڵن و بەرەو سۆڵدۆزی ورمێ بکشێنەوە بە پێی هەلومەرجی ئەوکات ژمارەیەک خەڵکی شار و ناوچە لەکاتی پاشەکشێی رووسەکاندا یارمەتی عوسمانییەکانیان دا بۆ راوەدوونانیان. زستانی ١٢٩٥ی هەتاوی بەرامبەر ١٩١٦ی زایینی لە کاتێکدا بەفرێکی قورس هەموو وڵاتی داپۆشیبوو رووسەکان بە مەبەستی دەرکردنی عوسمانییەکان و لە تۆڵەی تێکشکانەکانی پێشوویان هێرشیان کردەوە سەرشار و خوالێخۆشبوو قازی فەتاح مامی قازی عەلی کە کەسایەتیەکی بەناوبانگی موکریان بوو و بەرگریی لە شار و هاوڵاتیانی خۆی کردبوو و پاش بەرگریەکی دلێرانە لە شەرێکی نابەرابەردا کە رێگەی دەرباز بوون و رۆیشتن بۆ بەشێکی زۆر لە خەڵکی سابلاغ دەکاتەوە بە دەستی سەربازە رووسەکان کوژرا، ئێستا گۆڕەکەی لە حەوشەی مزگەوتی شادەرۆیش دا لە تەنیشت ماڵی قازی محەممەدەوەیە. پاش شەهیدبوونی قازی فەتاح رووسەکان بە رق و تووڕەییەکی لەڕادەبەدەرەوە دەڕژێنە نێو شار و تا ٢٤ سەعات خەڵکی بێ تاوانی شار قەتڵوبڕ دەکەن. هێندێ شوێنی شار بە تایبەت ماڵەکەی قازی عەلی و کتێبخانەی تایبەتییەکەی کە سەدان کتێبی بە نرخ و کەم وێنەی تێدابوو؛ دەسووتێنن.

هەروەها سێ کوڕی قازی فەتاح بە ناوەکانی عەبدلرەحمان (سالار) و محەممەد (ملامحەممەد قازی) و مەحموود (مەنسور سوڵتان) پاش ماوەیەک دەست بەسەری بۆ سیبری دوور دەخەنەوە و تا کۆتایی شەڕی یەکەم لەوێ بەدیلێتی دەمێنینەوە.

قازی فەتاحیش لەگەڵ کوڕەگەورەکەی کە ناوی میرزا عەوڵا بوو، ناچاردەبن بۆ ناوچەی هەوشار و دێهاتی حاجی سەرداری

هەو شار دێهاتی خاکی بەگ و زەکی بەگ. بچن میرزا عەولا هەر لەوێ سەردەنێتەوە.

پاش کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨دا؛ بنەماڵەی قازی عەلی و براکانی دەگەڕێنەوە شارەکەیان و دەست دەکەنەوە بە چاک کردنەوەی ماڵە سووتاو و وێران کراوەکانیان لە ماوەی ئەو کۆچە زۆرەملێیەدا چەندین کەس لە بنەماڵەی قازی بۆ وێنە زیباخانمی ژنی دووهەمی قازی عەلی و میرزا عەبدالخالق پێشنوێژی جومعەی مەهاباد، باوکی وەرگێڕی ناودار، محەمەدی قازی کۆچی دوایی دەکەن.

پاش کۆتایی شەڕ خەڵکی دەربەدەر و هەژار و تالان کراوی کوردستان دەگەڕێنەوە بۆ شار و دێهاتەکانیان. پاش چەند ساڵ ماڵ بە کۆڵی و ئاوارەیی و لە ناوچوونی دەغڵودان و تالانی سەروەت و سامانیان؛ لە گەڕانەوەدا تووشی قاتو قڕی و بێ بژیوی دێن سەدان کەس لە قاتوقڕیدا بە هۆی نەخۆشیە وەکە بەرهەمی ئەم شەڕە ماڵ وێرانکەرە بوو تێدادەچن. ئێستاش باس و سەربردەی ساڵی قاتی و قڕی و مەرگی بە کۆمەڵی خەڵک هەروا لەسەر زار و زمانانە.

بەشی دووهەم:

## "کۆتایی جەنگ و شوێنەوارەکانی"

شەڕ کۆتایی هاتبوو و خەڵک خەریکی گەڕانەوە بۆ شوێنی ژیان و ئاوەدان کردنەوەی کاولکارییەکان و دەرمانی زامەکان و پەیداکردنی بژیوی پێداویستییەکانیان بوون.

دەوڵەتە سەرکەوتووەکانیش لە هزری دابەشکردنی جیهان و موڵک و میراتی دەوڵەتی عوسمانی بوون.

دەوڵەتی بەریتانیا، هێواش هێواش لەرێی دەست و پەیوەندییەکانیەوە بەهۆی بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە خەدیکی حکوومەتگەلێکی نوێ بوو لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا.

نەتەوەی کورد لە ژێر دەسەڵاتی دوو حکوومەتی عوسمانی و رووس دا. گەلێک زیانی ماڵی و گیانی و دەربەدەری و ماڵوێرانی تووش هات و نیشتیمان و زێدەکەی لەلایەن دوژمنە تورک و روسەکانەوە پێشێل و داگیرکرا. بەڵام هەواڵی ئەم رووداو و ئاڵوگۆڕییانەی کە پاش شەڕ دەگەیشتە ناوچەکە بوو بەهۆی وشیاری و رابوونی خەڵک و بە هۆی پێشینەی شەڕەکانی نێوان ئێران و عوسمانی کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، کوردستانیان

کردبۆوە مەیدانی تەڕاتێن و شەڕی خوێناویی دوژمنکارانەیان؛ بیری نەتەوە خوازی وردە و وردە لە دڵی خەڵکی کورددا چەکەرەی کرد. میرزا محەممەدی قازی کە لاوێکی (زیت) وشیار ناودار و تێگەیشتوو بوو؛ رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەکەوتە بەردڵی خەڵکی ناوچەکە، بە هۆی خوێندنەوەی ئەو رۆژنامە وگۆڤارانەی ئەوکات کە بە دەگمەن دەگەیشتنە ساوجبلاغ و بەکۆکردنەوەی زانیاری لەسەر تێکۆشانی ئازادیخوازانی کوردی کوردستانی عوسمانیی پێشوو؛ هەستی ئازادیخوازی لە ناوخیدا پشکووت و پەیوەندیی بە ئازادیخوازانی ئەوکاتەوە کرد.

ئەو بە هۆی تێکەلاوی و دۆستایەتی لەگەڵ میسیۆنی مەزەبیی ئەمریکی کە لە ژێر چاودێریی میستەرمیلەر mr. miller هاتبووە سابلاخ و هەروەها بە ئاشنایەتیی لەگەڵ دکتۆر شالک "shalek" ی ئەڵمانی دەستی کرد بە فێربوونی زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و بەو زانیاری و هەوالانەی لەرێگەی ئەوانەوە بە دەستی دێنان رۆژ بەرۆژ ئاستی تێکە یشتوویی و زانیارییەکانی بەرزتر دەبۆوە و باشتر لە بارودۆخی جیهان تێ دەگەیشت. ئەنجامدانی پەیمانی شێڤەر لە ساڵی ١٩٢٠ی زا دا پێشبینی کردنی پێکهاتنی حکوومەتێکی کوردی و شۆڕشی سمایل خانی سمکۆ لە ساڵی ١٩٢١ی ز داو هێرشی سمکۆ بۆ سەر مەهاباد لە ساڵی ١٩٢٢ی ز.دا کاریگەرییەکی زۆریان کردە سەر باردۆخی ئەوکاتی نەتەوەی کورد. دەکرێ بڵێین ئەو رووداوانە تاڕادەیەک چاو و گوێی میرزا محەممەدی قازی یان کردەوە و بۆیەش ئاگاداری هەموو ئەم رووداوانە بوو.

رووداوە کتوپڕ و یەک لەدوای یەکەکانی ئەوکات، بەستنی پەیمانی لۆزان لە ساڵی ١٩٢٣ی ز دا و پێشێلکردنی ماف و بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد لە لایەن بەریتانیاوە و سات و سەودا لەگەڵ کەماڵ ئەتاتورک و بەشوێن ئەودا سەرهەڵدانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٥دا بۆ دەستەبەرکردنی مافە پێشێل کراوەکانی نەتەوەی کورد و شۆڕشەکانی دیکەی ئازادیخوازانی کوردی تورکیا بەڕێبەرایەتی ئیحسان نووری پاشا لە ساڵەکانی ١٩٢٧ەوە هەتا ١٩٣٠ی ز.دا کە بەشۆڕشی ئاگری بە نێوبانگە؛ شتێک نەبوون لە بەردیدی وردبینی میرزا محەممەدی قازی و هەرکوردێکی ئازادیخوازی دیکە ون بێ و سەرنجیان رانەکێشێ.

لە کاتی شۆڕشی شێخ محەممەدی خیابانیدا، کومیتەیەکیش لە ساوجبلاغ بەهاوکاری و هاوفکریی میرزا حەسەنی سەیفولقوزات و خودی قازی محەممەد و چەند کەسی تر لە رووناکبیرانی ئەوکات بۆ ێنە حاجی مستەفا داوودی و حاجی موعین و میرزا خەلیلی بلووری پێکهات.

لە ساڵەکانی ١٩٢٧ - ١٩٣٠ی ز. دا کە شۆڕشی ئاگری لە ئارادا بوو، قازی محەممەد بەنهێنی هاوبیری و هاوکاریی ئازادیخوازانی کوردی تورکیای دەکرد و بە هاوکاریی چەند نەتەوە خوازێکی دیکەی وەک مەلا ئەحمەدی فەوزی و شێخ ئەحمەدی سریل ئاوا، لەگەڵ رێبەرانی "کۆمیتەی خۆیبوون" لە تورکیا و کوردەکانی عێراق پەیوەندیی هەبوو. حکوومەتی رەزاشای پەهلەوی کە ساڵی ١٢٩٩ی.هەتاوی- ١٩٢٠ی.زایینی کودەتا هاتبووە سەرکار، وەردە

ورده پێدەگەیشت و بۆ لە ناو بردن و سرِینەوەی بیرۆکەی ئازادیخوازیی نەتەوەی کورد، یارمەتی و هاوکاریی کەماڵ ئەتاتورکی دەکرد.

لە ساوجبلاغیش دایرەی حکوومی، دادەمەزران و قوتابخانە بە شێوەی نوێ دروست دەکران. میرزا محەممەد قازی کە خوێندنی بە تاکە رێگای رزگاریی نەتەوەی کورد دەزانی لە ساڵی ١٣٠٥هەتاوی- ١٩٢٦ی.زاینی دا سەرۆکایەتی ئیدارەی پەروەدە و راهێانی ساوجبلاغ وە ئەستۆگرت و بۆ پێک هێنانی قوتابخانە بە شێوەی مۆدێرن و ئەمرۆیی زۆر هەولی دەدا.

قوتابیانی قوتابخانەی سەعادەت لە مەیدانی قوتابخانەدا لەگەڵ مامۆستاکانیان: لە راستەوە: قازی محەمەد، قادری، سەیفولقوزات، شوجاعی بەرێوەبەری قوتابخانە، میرزا ئیبراهیم قازی، ئەحمەد تەرجانیزادە (١٣٠٢/ ١٩٢٣)

لەسەردەمی سەرۆکایەتیی ئەودا. یەکەمین قوتابخانەی کوڕان بە شێوەی نوێ بەناوی قوتابخانەی سەعادەت و قوتابخانەی کچان بەناوی پێرماس لە سابڵاخ کرانەوە. میرزا محەممەد قازی لەو سالأنەدا کە سەرۆکایەتیی دایرەی پەروەردە و فێرکردنی لە ئەستۆبوو، کەوتەبیری زەماوندکردن بەپێی دابونەریتی باوی ئەودەم، بنەماڵەکەی کچی (گەنج عەلی بەگی) فەیزوڵلابەگی یان بۆ دیتەوە. میرزا محەممەدی قازی، هەر بە بیری ئازادیخوازانەوە کە هەیبوو و بە پێچەوانەی نەریتەکانی ئەوکات داوا دەکات بەرلەزەماوەند چاوی بە کچە خاڵەکەی بکەوێ سەربارەت بە ژیانی هاوسەری بیدوێنێ. (گەنج عەلی خان) ئەم پێشنیارە بە پێچەوانەی داب و نەریتی سەردەم دەزانێ و قبووڵی ناکا و کچەکەی نادا بە خوارزاکەی.

ساڵی ۱۳۰۹ی.هەتاوی- ۱۹۳۰ی.زاینی میرزا محەممەدی قازی لەگەڵ ئافرەتێکی ساوجبلاغی بەناوی میناخانم، زەماوەندی کرد. باوکی بەرێزیان واتە قازی عەلی ساڵی ۱۳۱۰ی.هەتاوی- ۱۹۱۳زاینی کۆچی دوایی کرد و تەختی دادەوەریی شەرعیی سابڵاخ و موکریان بۆ قازی محەممەد بەجێما. لە رۆژی مەرگی قازی عەلی دا. هەموو دووکان و بازاڕی شار داخران و پرسەی گشتی راگەیەندرا. پاش رێورەسمی بە خاک سپاردنی قازی عەلی؛ زانایان و پیاو ماقووڵانی شار عەبای قازی عەلی یان بەشانی قازی محەممەد دادا و لەسەر تەختی دادوەری لە جێی باوکی، دایان نا. بەو جۆرە جێبەجێ کردن و چارەسەریی کاروبار و کێشەی خەڵکی شار و ناوچە بە دەستی لێهاتووی کوڕە گەورەی قازی عەلی سپێردرا.

قازی محەممەد دەستی لە سەرۆکایەتی پەروەردە کێشاوە و بەرپرسیاریەتی و ئەرکی هەموو کاروباری شار و ناوچەکەی گرتە ئەستۆ و بەو پەڕی هەست بە بەرپرسیاریەتی، هۆگری و ئەوینەوە بۆ جێبەجێ کردن و نەهێشتنی گیروگرفت و ناکۆکییەکانی خەڵک و ناوچەی موکریان تێکۆشا.

کاک عەوڵای ناهید یەکێک لە گەورە پیاوانی ناوداری کوردستان و ویچنەری خەڵکی سەقز و بانە لە خولەکانی ١١ و ١٢ و ١٣ی "ئەنجومەنی راوێژکاری میللی" ئەوکات لە کتێبی (بیرەوەرییەکانم)دا، سەبارەت بە قازی عەلی دەنووسێ (خوالێخۆشبوو قازی عەلی) پیاوێکی کەموێنە بوو . وێڕای ئەوەی لە زانستی عەقلی (معقول) و کەلامی (منقول)دا پسپۆڕ و دەکرێ بڵێن لە کوردستان دا وێنەی نەبوو؛ لە رادەبەدەر رۆشنبیر و نوێخواز و خاوەن خووڕەوشتی پاک بوو. جوامێر بوو. زۆر لەسەرە خۆو دڵۆڤان بوو، تەنانەت کەس نەیدیوە بە تووڕەیی بانگ لە نۆکەرێکیشی بکا."

قازی عەلی لە باری پلەی زانستی و فیقهیشەوە کەسایەتییەکی هەڵکەوتە بوو. میرزا حەسەنی سەیفولقوزاتی، مامی قازی عەلیش، یەکێک بوو لە ئەدیبان و شاعیرانی ناوداری ناوچەی موکریان و لە سابڵاخیش دا پیاوێکی ناسراو و نێو بەدەرەوە بوو. لە کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکانی دەرەوەی ناوچەی موکریانیش دا ناوبانگی دەرکردبوو. خاڵەکانی قازی محەممەدیش کە لە هۆزی فەزیوڵلابەگی بوون هەموو بە ناوبانگ و خانەدان و لە نێو عەشیرەتی فەیزوڵلا بەگی و عەشیرەتەکانی دیکەی ناوچەکە و دەرەوەی ناوچەشدا بە دەست و دڵ ئاوایی و بوێرییان، مەشهوور

بوون. خودی قازی محەممەد وێڕای کەسایەتیی بنەماڵەیی؛ هەم بەرەی باوکی و هەم بەرەی دایکی لە هەموو ناوچەی ڕۆژئاوای ئێراندا بە ناوبانگ و جێی حورمەت بوون و فێردەوسی وتەنی:
"نژاد از دو سو دارد این نیک پی"
"واتە ئەو پێ و قەدەم موبارەکە لە هەردوولاوە ڕەسەنە."

قازی محەممەد، پاش مەرگی باوکی بەڕێزیان و، وەئەستۆگرتنی کاروباری دادوەریش: هەروەک جاران بە تاسە و عەشقەوە خەریکی کاروباری ڕۆشنبیریی و هاندانی لاوان بوو بۆ خوێندن و لە هەولی دابینکردنی ئیمکاناتی زیاتردابوو بۆ مامۆستایانی خۆجێیی و دەرەکی. لە هەموو ڕێورەسمە فێرکاری و پەروەردەییەکاندا بەشداریی دەکرد. دەچووە یانە وەرزشییەکان و تۆپێنی دەکرد و بەمجۆرە لاوانی هان دەدا بۆ وەرزش کردن؛ لە دادوەری کردن و چارەسەرکردنی گیروگرفت و کێشەکانی خەڵکدا بەو پەڕی وردبینی و بێلایەنییەوە هەوڵی دەدا و کاری دەکرد. نیاز پاکیی ناوبراو ڕۆژ بە ڕۆژ پێگەی کۆمەلایەتییەکەی پتەوتر دەکرد. لەڕاستیدا ماڵی قازی محەممەد، ببوە پەناگەی لێقەوماوان و زوڵم لێکراوان. دەرگاری ماڵەکەی هەمیشە بۆ خەڵک ئاوەلابوو. ئەو لە دادوەری کردندا زۆر هێدی و وردبین بوو. بەوپەڕی بێ لایەنی و بێ هیچ چاوەڕوانییەک؛ بڕیار (حوکم)ی دەدا. ئەگەر شتێکی بە حەق و ڕاست زانیبا ڕای خۆی نەدەگۆڕی. بوێری قازی محەممەد وێردی سەر زمانی خەڵک بوو. قەت سەری بۆ ملهوڕان و نێردراوانی دەوڵەت دا نەدەنواند. لەکاتی حکوومەتی ڕەزاشادا ئەودەمەی سەید مەهدی فەروخ "ئوستانداراییی" "ئازەربایجان" بۆ سەراسوێی و

تاوتویێ کردنی بارودۆخی ناوچەکە هاتە مەهاباد گەورەپیاوان و سەرۆکی ئیدارەکان پێشوازییان لێکرد. ئەویش بۆ نواندن و چاوترسێن کردنی خەڵک و مەئمورەکانی؛ بانگی قازی محەممەد دەکا و دەڵێ: بۆچی "جلو بەرگی یۆنیفۆرمت لەبەرنەکردووە؟" قازی بەوپەڕی بوێرییەوە وەلامی دەداتەوە و دەڵێ: "من قازیی شار و ناوچەم و حەقی دادوەریی شەرعیم هەیە و ئازادم لە پۆشینی جلو بەرگی مەلایەتی دا" ئیدی هەڵدەستێ و بەجێیان دەهێڵێ و دەچێتەوە ماڵێ. هەرچی فەرمانداری و بەرپرسی ئیدارەکان تکای لێ دەکەن، حازر نابێ بچێتەوە پارێزگار.

حەوشەی مزگەوتی شا دەروێش لە مەهاباد، لە راستەوە: بەڕێزان رۆحانی سەرۆکی تۆمار و نیملاك، مەلا حوسێن مەجدی، مەلا عەبدوڵڵا مودەریس، میرزا وەهابی قازی، قازی مونعیم، کەریمی قازی، شەمسی واعیز، قازی محەمەد، مەلا سەدیق سدقی، مەلا محمد ماوەرانی، مەلامحەمەد لاهیجانی، سەدری قازی (١٣١٧/ ١٩٣٠)

قازی محەممەد خاوەنی هێندێ تایبەتمەندیی کەم وێنە بوو. بیرێکی پێشکەوتنخوازانەی هەبوو. زۆربەی کردەوەو ئاکارەکانی لەو کاتدا داهێنان و نەریت شکێنی بوون. هۆگرییەکی زۆری بە وەرزش بووە. لە ماڵەکەیدا، کالای وەرزشیی هەبووە. بەیانیان پاش خوێندنی نوێژی بەیانی لە مزگەوتی شادەرویش، "بۆ پیاسەکردن دەچووە دەرەوەی شار. ئەودەم لەو بەری شیروخورشیدی سوورەوە؛ خانووبەرەی دیکە نەبوو. قازی محەممەد، لەوێوە هەتا پردی سوور بە هەڵاتن دەڕۆیشت. مەلەوانێکی بە تواناش بوو هاوینان هەموو رۆژێ لە شوێنێک بە ناوی گۆمی قازی مەلەی دەکرد. زۆر هۆگری موتالاکردن بوو. کاتی سەری سووک دەبوو، بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە. بە خوێندنەوەی کتێبی ئینگلیزی ئاستی زانیاریی خۆی دەبردەسەر. ئاگادای بارودۆخی ولاتانی دەرەوەش بوو، لە حاڵێکدا خەڵکی ئەودەم تەنانەت ئاگایان لە دەوروبەری خۆشیان نەبوو. قازی محەممەد زانیاریی باشی لەسەر رووداوە جیهانییەکانی ئەوکاتە هەبوو. ئەو بیانییانەی کە ئەودەم رێیان دەکەوتە مەهاباد، سەردانی قازی محەممەدیان دەکرد ئەویش زۆر بەرێز و حورمەتەوە پێشوازی لێ دەکردن بنەماڵەی قازی ئەوەندە بۆ میسیونەمەزهەبیە ئەمریکییەکان باش بوو کە دوو ئافرەتی سەر بەو شاندە بەناوەکانی "میس گۆدهارت" و "میسدال(٥) لە نێو خەڵکی شاردا بە ماڵی قازییان دەگوت ماڵی " "بابمان"

لەهەر پێشهاتێک دا کە لە ساڵەکانی ١٣٠٠هەتاوی– ١٩٢١زاینی- ١٣٢٠- ١٩٤١. دا لە مەهاباد و موکریاندا قەومابایە. قازی محەممەد و ئەبوولقاسم سەدری قازیی برای، دەبوونە دەمڕاستی خەڵک و

تەواوی کاروباری کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئیداری؛ بەڕێنوێنی و ئاگاداریی ئەوان جێبەجێ دەکرا. ساڵی ١٣٠٧ی.هەتاوی-١٩٢٨،زاینی کە بۆ یەکەمجار، کۆمەڵەی شێروخورشیدی سوور، لە مەهاباد، پێکهات؛ قازی محەممەد پارچەزەوییەکی پێشکەش کردن

کاتی رووداوەکەی نەخۆشخانەی شیرو خورشیدی سور لە مەهاباد لە راستەوە بۆ چەپ: سەدرولعولەما، نوێنەری نێردراو لە پایتەختەوە، سەیفولقوزات، حەسەن داوودی، شێخ عەبدولرەحیم، حاکمی ئەو کات، سەرگورد باستی، دکتۆر ئەمیر ئەعلەم، سەرهەنگ محەمەد عەلی خان، قازی عەلی، قازی مونعیم، قازی محەمەد، رەحمەت شافعی، نەناسراو، قادری، سەرۆکی دارایی، سەرۆکی شارەوانی، سەروانی سوپا، کارمەندی گومرگ، دوو کەس لە عەشیرەتی مەنگوڕ، ریزی کۆتایی کەسی دووەم سەعید بابی ١٣٠٨/ ١٩٢٩

کە دواتر نەخۆشخانەیەکی لێ سازکرا ئەو نەخۆشخانەیە نزیکەی چل ساڵ بووبە شوێنی خزمەتی پزیشکی و دەرمانی بۆ خەڵکی شار و دێهاتەکانی دەوروبەری. کەچی بەداخەوە ئێستا بووەتە کەلاوە. قازی محەممەد لە سەرەتای دامەزرانی کۆمەڵەی شێروخورشیدی سوورەوە هەتا ساڵی ١٣٢١ی.ه بە ویستی خۆی

سەرۆکایەتیی ئەو کۆمەڵەیەی وەئەستۆگرت و وێڕای کاروبارەکانی دیکەی ئەو خزمەتە ئینسانییە بەنرخەشی بەجێ دەگەیاند. ساڵی ١٣١٥ی.ە بە فەرمانی ڕەزاشا ناوی شاری ساوجبلاغی موکری کرا بە مەهاباد(٦).

قازی محەممەد بۆ ئاگاداریی و تێگەیشتن لەوەزعی ڕۆژانەی جیهانی و نێو خۆی وڵات. زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی وەک: ڕۆژنامەکانی "شفق سرخ" و "اطلاعات" و گۆڤاری "پیمان" ی ئەحمەد کەسرەوی و گۆڤاری کوردیی گەلاوێژ- کە مامۆستا عەلادین سەجادی لە بەغدا دەری دەکرد؛ پەیدای دەکرد و ناو و دەیخوێندنەوە.

لە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی مانگی پووشپەڕی ١٣١٥ی هەتاوی- ١٩٣٦ز. دا، بارانێکی توند دای کرد و لافاوێکی ماڵوێرانکەر لە مەهاباد هەستا کە بەشێکی زۆری ئەو ماڵانەی کە لەسەر ڕێ بوون، وێرانی کردن و کەلوپەلەکەیانی ڕادا و دووکان و بازاڕی شار، پڕبوون لە قوڕولیتە و خەسار و زیانێکی قەرەبوو نەکراوە وە خەڵک کەوت. ژمارەیەکیش خەڵک خنکان. قازی محەممەد بە سواری ئەسپ، زۆر بوێرانە چووە یارمەتیی خەڵک و چەند کەسێکی لە خنکان ڕزگار کرد.

خەڵکی مەهاباد ئێستاش ئەو سێڵاوەیان لە بیر نەچۆتەوە و ئەو ساڵە بە "ساڵی سێڵا"وەکە مەشهوورە. هەروەها لە سەرەتای سەربازگیری لە مەهاباد و بۆکاندا، سەدری قازی- کە ئەندامی کۆمیسیۆنی سەربازگرتن و کەیخودای گەڕەک بوو- خزمەت و

یارمەتیەکی کە موینە بە خەڵکی و زاڵە هاتووی ناوچەکە کرد کە ئێستاش بەساڵا چووان فەرامۆشیان نەکردووە.

بانگ کردنی خەڵک بۆ سەربازی و سەربازگیری کە ئەوکات پێی دەگوترا (ئیجباری)، ترسێکی سەیری خستبوە دڵی خەڵکەوە. خەڵک بۆ دەربازبوونیان لە چنگی خزمەتی ئیجباری، پەنایان بۆ هەموو شتێک دەبرد. ئەوان چاکە و خزمەتێکی بەنرخ و فەرامۆش نەکراویان دەرحەق بە خەڵک کرد. لە سەریەک ئەو دوو برایە (قازی محەممەد و سەدری قازی) هەرچی لە دەستیان هات و لە توانایان دابوو، لە پێناو بەرژەوەندیی خەڵکی موکریان و خەڵکی مەهاباد دا، کردیان.

# بەشی سێهەم

## لە خەرمانانی ١٣٢٠ەوە هەتا ١٣٢٦ی. هـ (١٩٤١ - ١٩٤٧)

نەتەوەکانی ئێران بەتایبەتی کورد لە ژێر دەسەڵاتی رەشی سەرەڕۆیانەی رەزاشادا بڕستیان لێ بڕابوو. نەتەوەی کورد لەژێر گوشاری قورسی حکومەتی رەزاخانی دا، لە ژێرقەمچیی ژەندەرمە و پاسەوانی و لە دەربەدەری و کوشتار و تاڵان و بڕۆدا ببوونە جەستەیەکی بێ گیان کە برسی و تینوو؛ بۆ ئەوەی ئاگاداری ژیانی شایانە خەڵکی وڵاتانی دیکەبن لە گۆڕستانێکی بێ دەنگدا ژیانی کۆیلەتی و نەگبەتییان تێپەڕدەکرد. لەوەها هەلومەرجێکدا بوو کە شەڕی دووهەمی جیهانی لە نێوان ئەڵمانیا، ئیتالیا و ژاپۆن بەناوی (بەرەی هاودەنگ) لەو لاشەوە؛ بەریتانیا، فەرەنسا، سۆڤیەت و (هاوپەیمان) دەستی پێ کرد. سوپای ئەلمانی هیتلەری بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر وڵاتانی بەلژک، هۆڵەندا، فەرەنسا، نەمسا، و بەشێک لەخاکی سۆڤیەتی داگیرکرد. هاوپەیمانان لە شەڕدا؛ بەمەبەستی یارمەتی گەیاندن بە یەکێتی سۆڤیەت و بەناوی دەرکردنی ئەلمانییەکان لە ئێران؛ کە بە هاوکاریی رەزاخان دەستیان بەسەر

ئێران داگرتبوو، لەخەرمانانی ١٣٢٠ی.هەتاوی- ١٩٤١زایینی دا هێزەکانی بەریتانیا لە رۆژئاوا و باشوورەوە و سوپای سۆڤیەت لە باکوورەوە سنوورەکانی ئێرانیان بڕی و بەشێکی بەرینی ئەو وڵاتەیان داگیرکرد[٧].

## لێکهەڵوەشانەوەی ئەرتەشی پاشایەتی

بەهاتنی هێزەکانی بەریتانیا و سۆڤیەت، شیرازەی کاروباری دەوڵەتیی رەزاشا لێک ترازا و، ئەو ئەرتەشەی کە شاهەنشا ٢٠ساڵ بوو بەشێکی زۆری سەرمایەی وڵاتی بۆ پڕچەک کردنی تەرخان کردبوو، خۆی رانەگرت و هەلوەشایەوە. تەنانەت هێزە ئینتزامیەکانیش (ئاسایش). مامۆستا هەژار وتەنی:

بە بڵاوبوونەوەی دووپەڕ ئاگاهی بوو بڵاو ئەرتەشی شاهەنشاهی بەمجۆرە ئازادیخوازان و ئەو زیندانییانەی کە لە مێژ بوو لە چاڵە رەشەکانی رێژیمی رەزاخان دا بەتاوانی لایەنگری لە دیموکراسی یا بە هەر بیانوویەکی دیکە، تووشی ئازارو ئەشکەنجە ببوون، لە بەندیخانەکان ئازاد کران. دوورخراوەکان کە زۆربەیان عەشیرەت و هۆزە کوردەکان بوون گەڕانەوە سەرماڵ و حاڵیان. زەبروزنگی بیست ساڵەی دەسەڵاتی زاڵمانەی رەزاخان، کۆتایی هات و خەڵکی چەوساوەی ئێران، پشوویەکیان وەبەر هاتەوە و هەاوی ئازادییان هەڵمژی و لە قەفەزی دیلێتی هاتنەدەرەوە لە شەققەی باڵیان دا. بە جۆرێک کە هێرشی هێزە بیانییەکان و داگیرکرانی وڵات لەلایەن بێگانەو بوردومانی شارەکانی

کوردستانیان بەلاوە خۆشتر بوو لەدەسەڵاتی سەرەڕۆیی و پڕ لە سەرکوت و زەبروزەنگی رەزاخان و دەست و پەیوەندە زاڵمەکانی.

چونکە پۆلیس و ژاندرامە بێ بەزەییەکانی رەزاخان، بەلاسایی کردنەوەیەکی چەوت لە رۆژئاوا؛ تەنانەت نەیاندەهێشت خەڵک جلوبەرگی رەسەنی خۆیان بپشۆن و بە بیانووی یەکدەست کردنی فەرهەنگەکەی، بێ حورمەتی و سوکایەتییەکی لە رادەبەدەریان بە ژنان و پیاوانی کورد دەکرد. هەر بۆیەش بە هەڵکردنی شنەبای ئازادی، خەڵک پشویەکیان وەبەر هاتەوە و تازە هەستیان بەوە دەکرد کە لە چ گرتووخانەیەکی سامناکدا گرفتاربوون و لەچ حاڵ و گوزەرانێکدا ژیاون. رۆژنامەو بڵاوکراوەکان لە سانسۆر رزگاربوون و بیرۆکەی ئازادی و باوەڕی سیاسی وەک شەپۆلێکی نوێ وڵاتی داگرت و هەر چوار گۆشە ئێرانی تەنییەوە. نەتەوەی کوردیش کە لەژێر ستەمی لە رادەبەدەر رزگار ببوو پێشوازیی لە پێکهێنانی حیزب و رێکخراوە سیاسییەکەی واتە کۆمەڵەی ژ.ک کرد. لە لاپەڕەکانی دواتردا باس لەو کۆمەڵەیە دەکەین.

پاش ئەوەی سەربازەکانی ئێران لەلایەن هێزەبیانیەکانەوە چەک کران، گەڕانەوە بۆ شار و دێهاتەکانیان و ئەوانەی بە دڵ گەنجتربوون چەکەکانیان دەگەڵ خۆیان بردەوە. سەربازەکانی سەربازخانەی سەردەشت کە پاش چەک کردنیان لەو پەڕی سەر لێشێواویدا کەوتنە بەرهێرشی عەشیرەتەکانی نێوان سەردەشت و مەهاباد؛ کاتی گەیشتنە مەهاباد، بە ئەمری قازی محەممەد دڵخۆشیان دراوە و بەوپەڕی دلۆڤانییەوە پارە و بژێوی رێگەیان پێدرا و ناردرانەوە بۆ شارەکانیان.

فرۆکەکانی سۆڤیەت شاری مەهابادیان بۆردومان کرد و چەندکەسێک کوشت و هێزەکانی سۆڤیەت شاری مەهابادیان گرت و چەکی سەربازە ئێرانییەکانیان داماڵی و چەکوچۆڵ و تەقەمەنییەکانیان لێ ئەستاند و دواتر شاریان بەجێ هێشت ئەرکی پاراستن و بەرێوەبردنی کاروباری شار و ئیدارەکانی مەهاباد، کەوتە ئەستۆی قازی محەممەد و براکەی کە ببونە پشت و پەنای خەڵک. ئەوان بەو پەڕی وردبینی و دڵسۆزییەوە خەڵکی مەهابادیان لە رووداو و ئەگەری هێرشی عەشیرەتەکانی دەپاراست. عەشیرەتەکان هەموویان چەکداربوون. حەمەڕشیدخان ناوچەی سەقز و بانەی گرتبوو و لەوێ فەرمانڕەوایی دەکرد. شێخ لەتیفی کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی بەرزنجی شاری سەردەشتی گرتبوو. سات بە سات ئەگەری هێرشی عەشیرەتەکان بۆ سەر مەهاباد و داگیرکردنی هەبوو. قازی محەممەد خۆی بۆ دابین کردنی ئاسایش و پاراستنی شار ئامادەکرد و شەوانە بەچەکەوە بەسەر شار رادەگەیشت و ێڕای هاوکاری لەگەڵ بەرپرسان سەری لە پۆستی نیگابانییەکان دەدا و رێنوێنی دەکردن.

حەمە رشید خان و بەگزادەکانی بانە بەگرتنی سەقز رووبەری ناوچەی ژێردەسەڵاتی خۆیان بەرفرەوانترکردەوە و قازی محەممەد بە مەبەستی پاراستنی ئاشایش و هێمنیی مەهاباد و نیشاندانی هێز و بۆێری خۆی و هەروەها بۆ پشتگیری لە دەستدرێژیی عەشیرەتەکان بۆ سەر مەهاباد، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ حەمەرەشیدخان کرد و بانگهێشتنی کرد بۆ مەهاباد و سەبارەت

بەکاروباری داهاتووی ناوچەکە و ئەوکارانەی پێویستە بکرێن، راوێژی دەگەڵ کرد.

گوتمان؛ یەکێک لە دەستکەوتەکانی شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ خەڵکی ئێران و کوردستان؛ لاچوونی سێبەری رەش و نەگریسی دیکتاتۆریی پەهلەوی و ئازادی و رزگاریی خەڵک بوو لە کۆت و بەند و کۆیلایەتی. بیری خەڵکی ناوچە کە بەهۆی کۆتایی هاتنی زیادەیە و زەبروزەنگی دەسەڵاتدارانەوە ئازاد ببوو. بەو هوشیارییەی کە لە ئاکامی پسانی زنجیری کۆیلایەتی و دیلێتی لە جەستە و رۆحی میللەت بەرهەم هاتبوو. لە ئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەک لە رۆشنبیرانی مەهابادی بە کەڵک وەرگرتن لەو کەشە ئازادە کەوتنە بیری رزگاری و یەکگرتوویی و یەکێتی لە نێوان خەڵکدا و پێکهێنانی حیزب و رێکخراوێک کە بتوانێ بۆ داهاتووی ئەو نەتەوە هەژار و بەشخوراوە پاڵپشتێک بێ و دووبەرەکی و ناکۆکییەکان بکا بە یەکێتی و یەکگرتوویی و ئەو نەتەوە لێک بڵاوە بکەوێتە بیری ئازادی و دیاری کردنی چارەنووسی خۆی و پێکهێنانی دەوڵەتێک. بەو پێیە لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ی.هەتاوی-١٩٤١زاینی دا بە هاوکاری و هاوبیریی ژمارەیەک رووناکبیر بنەمای کۆمەڵەی (ژ. ک) لە مەهاباد دامەزرا، کۆمەڵەی (ژ. ک) کە بە کورتی پێی دەگوترا، کۆمەڵە تەشکیلاتی نهێنی هەبوو. یەکێک لە مەرجەکانی ئەندامبوون لەو کۆمەڵەیەدا سوێند خواردن بە قورئانی پیرۆز بوو.

# کۆمەڵەی ژ. ک

## دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (ژ. ك) بریتین لە:

عەبدولڕەحمان زەبیحی- حوسێن زێڕینگەران (فرووهەر)- مەلا قادری مودەڕیسی- عەبدولڕەحمانی ئیمامی، محەممەد یاهو-رەحمان هەڵوا- حەمەدەمین شەڕەفی- قاسم قادری قازی- مەلا عەوڵای داودی- محەممەد سەلیمی- ئەحمەد عیلمی- محەممەد نانەوازادە و عەزیزی زەندی- لە هێندێ نووسراوەشدا- ناوی عەلی مەحموودی- محەممەد ئەسحابی- عەبدولڕەحمان کیانی و سەدیق حەیدەریش وەک دامەزرێنەرانی ژ. ک هاتووە. هەروەها میرحاج ئەحمەدیش لە لایەن کوردەکانی عێراق و حیزبی هیواوە لە کاتی پێکهێنانی ژ. ک دا حوزووری هەبووە.

بە بڕوای من، هەر ئەو سێزدەکەسەی یەکەم، دامەزرێنەری کۆمەڵەی ژ. ک بوون.

بەهۆی ئەوەی خەڵک تینووی ئازادی بوون، ئەم تەشکیلاتە نهێنییە زۆر بە خێرایی لە مەهاباد و شار و دێهاتەکانی دەوروبەری دا گەشەی کرد و لەبەرئەوەی خەڵک  روویان لە ژ. ک کردو لەملاولا باسی مەرامنامە و باوەڕ بە قورئان و ئەو سوێندانەیان کردبوو کە بەمەبەستی پێشکەوتنی کارەکان دەخوران، مەهاباد ببوو بە یۆتۆپیایەک. ئەندامانی کۆمەڵە یەکتریان نەدەناسی. بێجگە لە ئەندامانی شاخ کە سێ کەس بوون و ئاگایان لە ئەندامەتیی کەسی دیکە نەبوو.

زۆربەی خەڵکی شار یەکتریان بە چاوی خوشک و برا چاولێدەکرد تەبایی نێوان خەڵکی شار و بوونی ئاسایش بەبێ هێزی

دەوڵەت وێڕای چەکدار بوونی خەڵک جێی سەرسوڕمان بوو. هەستی یاریدەدەری و هاوبیری گەیشتبوە ئاستێک کە خەڵکی شار شەوانە دەرگای ماڵیان پێوە نەدەدا. دزی و دەست درێژی و ملهوڕی هەرنەبوو. (ژ. ک) ڕۆژ بەرۆژ بەرینتر دەبۆوە. بەرێوەبەرانی (ژ. ک) هەستیان بە بۆشاییەک لە نێوە تەشکیلاتەکەیاندا دەکرد. چونکە هەتا ساڵێک پاش دامەزرانی (ژ. ک) قازی محەممەد کە هەروا بەسەرمەهاباد رادەگەیشت نەببووە ئەندامی "ژ. ک" بەڵام کادیری رێبەرایەتی کۆمەڵەی (ژ. ک) بەو هیوایەی کە رۆژێک لەرۆژان قازی محەممەد ببێتە ئەندامی کۆمەڵە هێشتا شوێنی ئەندامی یەکەمیان بە بەتاڵی هێشتبووە و سەرەڕای ئەوەش، هەرکارێکی گرینگ لە شار و ناوچەدا پێش هاتبایە، هەربە رێنوێنی و یارمەتیی ناوبراو جێبەجێیان دەکرد. هەتا ئەوەی چاوەڕوانییەکەیان وەدی هات و بەهاتنی قازی محەممەد بۆ نێو کۆمەڵەی (ژ. ک) زیاتر لە جاران پێگەی تەشکیلاتییان لە نێو خەڵکی موکریان و تەنانەت ناوچە کورد نیشینەکانی دیکەش لە ئێران و عێراقدا پتەوتر بوو.

## پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو.

پاییزی ساڵی ١٣٢٠ی.هەتاوی بەریتانییەکان ژمارەیەک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی بۆکان، مەهاباد، سەقز و بانەیان بانگهێشت کردبوو کە لە بۆکان بۆ وتووێژ لەسەر کاروباری ناوچەکە. هێشتا بانگهێشت کراوەکان بە تەواوی لە شوێنی دیاریکراو (میوانخانەی کۆنی بۆکان) کۆ نەببوونەوە و بەریتانییەکانیش دیارنەبوون لە

ناکاو هەواڵ هات: ئەوە دوو ماشێن لە بەردەرکی میوانخانە وستاوە و چەند ئەفسەری رووسیی لێیان دابەزیون. هەڵبەت تائەوکات چەک هەڵگرتنی بە ئاشکر لەلای رووسییەکان قەدەغە بوو. بانگهێشت کراوانیش کە هەموان چەکدار بوون ئاڵۆزکان و ویستیان چەکەکان بشارنەوە. بەڵام، فریانەکەوتن و ئەفسەرە رووسەکان هاتنەسەرێ و بە رووگەشی و مێهرەبانییەوە سڵاویان لە میوانەکان کرد و پێیان گوتن کە چەک هەڵگرتن لە روانگەی ئەوانەوە ئێرادێکی شتێکی ئاساییە. ئەو قسەیە ئاوپڕژێنێ دڵی ئامادەبوانی کرد. قەرار بوو سەدری قازیی برای محەممەدیش "خاڵی نووسەر" لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربێ. هەروەها مامەگەورەم عەلی بەگی شێرزادیش بۆ بەشداریی ئەم کۆبوونەوەیە بانگهێشتن کرابووو. منیش لە گەڵیان بۆ دیتنی خاڵم لەو کۆڕەدا بووم. ئەفسەری پایەبەرزی سۆڤیەت کە ناوی سەلیم ئاتاکشی ئۆف بوو لەگەڵ هاورێ چەکدارەکەی کە کوردێک بوو بە ناوی جەعفەرۆف؛ وێرای دەربڕینی ئێزنی چەک هەڵگرتن و خۆشحاڵی لە چاوپێکەوتنی سەرۆک عەشیرەتەکان. گوتیان، ئێمە هاتووین برایانی کوردمان بۆ باکۆ و دیتنی سۆڤیەت بانگێشتن بکەین، داوایان لەبەشدارانی کۆڕەکە کرد هەرچی زووتر بێنە مەهاباد و لەوێوە، لەگەڵ داوەت کراوەکانی تر بەرەو و باکۆ وەڕی کەون.

## "سەفەر بۆ باکۆ"

لەو سەفەرەدا سی کەس لە پیاوماقوڵان و سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەکە بۆ ماوەی دوو هەفتە لەگەڵ قازی محەممەد چوونە باکۆ.

مەبەستی رووسەکان لەو بانگهێشتنە راگرتنی دڵی کوردەکان بوو، ئەوان بەو شێوەیە دەیانویست خۆیان بە دۆستی کورد لە قەڵەم بدەن و کوردەکان لە خۆیان نزیکتر بکەنەوە و نەهێڵن بەلای بەریتانییەکاندا بشکێنەوە. لەلایەکی دیکەوە کوردەکان و عەشیرەتەکانی دەوروبەری ورمێ برێک دەگەڵ ئازربایجانییەکان ناکۆکییان هەبوو هەر بۆیەش میرجەعفەری باقرۆف، سەرکۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت دەیویست کوردەکان و ئازەرییەکانی ناوچەکە بپارێزێ بەڵام قازی محەممەد مەبەستی دیکەی هەبوو. ئەو دەیویست سەرنجی رووسەکان زیاتر بۆلای کێشەی کورد رابکێشێ و لە پێناو ئامانجەکانی (ژ. ک)دا کە ئازادیی نەتەوەی کورد بوو یارمەتیان لێ وەرگرێ.

قازی محەممەد بە هێنانەگۆڕی بۆچوون و داخوازییەکانی نەتەوەی کورد توانیی تا ڕادەیەک سەرنجی میرجەعفەری باقرۆف راکێشێ و ئەو راستییە بسەلمێنێ کە کوردەکان خوازیاری ئامانجی گەورەتری وەک مافی ئازادی و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیانن.

هەر بۆیەش پاش گەڕانەوەی لە باکۆ، بەورەیەکی پتەوترەوە لە هەمبەر کێشە و رووداوەکاندا راوەستا، قازی محەممەد لەگەڵ چەندکەس لە سەرۆک عەشیرەتەکانی مەنگوڕ و مامەش بەمەبەستی دڵ چاکردنەوە و نەهێشتنی ئەو کێشانەی هاتبوونە پێش سەردانێکی ورمێی کرد و عەشیرەتەکانی دەڤەری وەرمێ لە دمەقڕەوکێشەی لەگەڵ ئازەرییەکان گێڕاوە. دابەزینی ئاستی شەڕ و کێشە ناوچەییەکان پێشاندەری لێهاتوویی و هێزی قازی محەممەد بوو، لە پێراگەیشتن بە کاروباری ناوچەکە و بووە هۆی ئەوەی کە

لە باکووری ورمێی وە هەتا سەقز، هیچ تێکهەڵچوون و نێوان ناخۆشییەک لە نێوان کورد و ئازەری‌دا نەیەتەپێش.

## "پێشکەش کردنی چەك"

پاییزی ساڵی ١٣٢١ی.هەتاوی رووسەکان بڕێکیان چەک و چۆڵ و تەقەمەنی هێنا بۆ مەهاباد و لە تەنیشت پردی سوور، واتە دیواری هێڵی بەنداوی مەهاباد (بە لای رۆژئاوا) هەڵیان

پێشەوا قازی محەمەد لە رۆژانی لاوێتیدا لەلای راستییەوە رەحمان ئاغا دارلەك، لەلای چەپییەوە خوالێخۆشبوو سەدری قازی

رشت و قازی محەممەدیان لێ ئاگادار کردەوە. هەر ئەم شەوە تفەنگێکی برنەو و سەت فیشەکیان دا بە هەرکام لەو چوار سەت کەسەی خەڵکی مەهاباد کە لە پێشدا ناو نووسیان کردبوو. هەر ئەوشەوە بە دوو داشقە ژمارەیەک چەک و فیشەکیان هێنایە نێو شار، کە دواتر دران بەو کەسانەی بە پێویست زانرا.

## هێرش بۆ سەر شارەوانیی مەهاباد

رۆژی ١٣٢٣/١١/٢٦ی.ه-١٩٤٤ز لە شاری مەهاباد لە کۆبوونەوەیەکدا کە لەلایەن چەند کەسێکی توورە و داخ لە دڵەوە بەمەستی دەرکردنی فەرمانداری (کارتۆنیی)(١) مەهاباد بەناوی "سریع القلم" پێکهاتبوو، ژمارەیەک بە کەڵک وەرگرتنی نابەجێ لە هەستی خەڵکی شار و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کرد بۆوە سەر شارەوانیی مەهاباد و چەند پاسەوانێکیان کوشتبوو. دارایی و مێز و کورسیی شارەوانییان لە تو پەت کردبوو. ئەم رووداوە رەنگدانەوەی ناخۆشی لە نێو خەڵکی تاراندا هەبوو. خەڵکی مەهاباد کە بەنهێنی ببوونە ئەندامی (ژ. ک) پاراستنی ئاسایشی شار و پێکهێنانی کەشێکی هێمن و بێ قڕەیان لا، لە هەموو شتێک گرینگتر بوو ناو شاریان کرد بە ناوەندی راستەقینەی کوردستان و جێی هیوای نەتەوەی کورد و سەرپەنای هەژارانی ناوچەی موکریان بە دڵ لەو رووداوە ناڕەحەت و قەڵس بوون و بەرپەرچی ئاژاوە چییەکانیان دایەوە.

## چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزگاری ئەوکات

قازی محەممەد کە لەهەر پرس و رووداوێکدا تێگەیشتوویی و لێهاتوویی خۆی دەردەخست و مەزنی و ئیعتیباری بنەماڵەی قازی کە لە مێژ ساڵەوە پشت و پەنا و پەسیوی هەژارانی کوردستانن؛ بەرزتری دەکردەوە و هۆگری و سەرنجی پڕ لەرێزی خەڵکی موکریانی زیاتر بەرەو خۆی رادەکێشا و لێهاتوویی خۆی لە رێبەری کردنی نەتەوەکەی دا باشتر دەسەلماند. پاش ئەم ئاڵۆزییانەی دەوری ورمێ لەلایەن "شاوە" کە تەنیا- ناوی مابوو، خەلیل فەهیمی، وەزیری راوێژکار کە کرابووە پارێزگاری ئازەربایجان بەمەبەستی تاوتوێکردنی کێشەکان، هاتە ورمێ و مەهاباد و لە شاری مەهاباد لەلایەن قازی محەممەدەوە بەگەرمی پێشوازی لێکرا.

قازی محەممەد مەزلوومییەت و هەژاریی نەتەوەی کوردی بە درێژایی دەستەڵاتەکانی قاجار و پەهلەوی بۆ ئاغا فەهیمی شی کردەوە و پێی گوت سەردەمی سەرەڕۆیی و دیکتاتۆری بەسەر چووە و باشتروایە دەوڵەتی ئێران سەرنجێکی زیاتر بداتە ناوچە بێ بەشە کوردنشینەکان و خەویکیان بخوات.

## قبووڵی ئەندامەتی لە (ژ. ک)دا

قازی محەممەد بە قبووڵکردنی ئەندامەتیی (ژ. ک) بەناوی خوازراوی بینایی؛ بایەخ و ئیعتباری چالاکییە نەتەوەییەکانی بە لووتکە گەیاند و مەهابادی کرد بەناوەندی ئازادیخوازی و چالاکیی سیاسی کوردستان. هەربۆیەش ئازادیخوازانی کورد لە وڵاتانی

نما (لەقتە)یەك لە دادگای قازی محەممەد

توركیا، سووریە و عێراقەوە بۆ دیتنی مەهاباد و چاوپێكەوتن لەگەڵ بەرێوەبەرانی كۆمەڵەی (ژ. ك) دەهاتنە ئەم شارە. دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستانیش، مەلەفێكی دانسقەیان بۆ مەهاباد و میللەتی كورد كردبۆوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم كە قازی محەممەد لە ماڵی كاك ئەحمەدی ئیلاهی رێوڕەسمی سوێند خواردن بە قورئانی پیرۆز و ئەندامەتیی (ژ. ك)ی بەجێ هێنا.

## چالاکیەکانی (ژ. ك)

کۆمەڵەی (ژ. ك) پاش دامەزراندی لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ی.ه-١٩٤٢ی.زدا لە مەهاباد، دەستی کرد بە چالاکی و بە هۆی تامەزرۆیی خەڵک بۆ ئازادیی دەگەڵ پێشوازیی خەڵکی شار و ناوچەکە رووبەڕوو بۆوە. هەڵسوکەوت و ئاکاری ئەندامانی (ژ. ك)و ئەو عەشق و ئەوینەی بە چارەنووسی خەڵکیاندا بوو؛ بەئەندام بوون لە (ژ. ك)دا شانازییەکی مەزن بوو کە سەرەڕای نهێنی بوونی چالاکیەکانی؛ دەکرێ لە هەلسوکەوت و رەوشت پاکی و برایەتیی ئەوانەی ئەندامی (ژ. ك) بوون تێ بگەین کە پەیوەندی و رەفتاریان لەگەڵ خەڵک و هاوولاتیان زۆر مرۆڤانەبوو. تەواوی ئەندامانی (ژ. ك) نیشتمان پەروەر و ئازادیخواز بوون و لایەنگری بیری کومۆنیستی نەبوون.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٢٠ی.ه-١٩٤١ی.زدا عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەدی دێبوکری لەلایەن دەوڵەتی ناوەندییەوە کرا بە قایمقامی مەهاباد. بەهۆی پێشینەی دوژمنایەتیی عەلی ئاغا لەگەڵ بنەماڵەی قازی و خەڵک هاوکارییان نەدەکرد، بۆیەش ماوەی قایمقامیە تیەکەی زۆری نەخایاند و ناچار بوو وازی لێبێنێ و شار بەجێ بێڵێ. پاش رۆیشتنی ناوبراو ئاغای ("سریع القلم") کرا بە قایمقامی مەهاباد کە ئەویش هەر بەناو قایمقام بوو، ئەگەر یارمەتیی قازی محەممەد و سەدری قازی نەبایە نەیدەتوانێ تەنانەت تاقەرۆژێکیش لە مەهاباد بمێنێتەوە. شار لەڕاستیدا کەوتبۆوە دەستی قازی محەممەد و کاروباری شار و بەتایبەتی دابین کردنی هێمنی و ئاسایش لە ژێر چاودێریی ئەودا بوو.

## شانۆی دایکی نیشتمان

ڕووداوەکانی سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی و ئازادی خەڵک و هەڵکەوتنی ئەم ناوچەیە لە نێوان ناوچە داگیرکراوەکانی ژێردەستەڵاتی ڕووس و بەریتانیا و داگیر نەکرانی ئەم بەشە؛ دەرفەتێکی زێڕینی ڕەخساند بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی بیرۆکەی ئازادیخوازیی و چالاکییە هونەرییەکان. یەکێک لەو چالاکیە هونەرییانەی کە ئەوکات کەوتەبەر سەرەنج و پێشوازیی خەڵک بەڕێوەبردنی شانۆی "دایکی نیشتیمان"[9] بوو کە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر هەستی نەتەوایەتیی خەڵک و ڕاکێشانیان بەرەو نیشتیمان پەروەری دانا. ئەوانەی ئەو شاندیان وە جۆش دەهێنا. بەهۆی پێشوازیی گەرمی خەڵک لەو شانۆ حەماسییە؛ لە چەند شاری دیکەش پێشان درا.

## دامەرزانی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە عێراق

یەکێک لە بەرنامەگرینگە سیاسیەکان پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوو کە پێشتر لقێکی کرمەڵەی (ژ. ک) و حیزبی ڕزگاری و چەند حیزبی دیکە لەوێ چالاکییان نواندبوو. لەسەر پێشنیاری ژەنەراڵ بارزانی؛ هەمزە عبدوڵڵا کە کوردێکی چالاک و ئازادیخوازی عێراق بوو، بۆ دامەزراندنی حیزبی دیموکرات کە دواتر ناوی نرا پارتی دێموکراتی کوردستان؛ چووە عێراق و لەوێ تەشکیلاتی حیزبی پێکهێناو ڕێکی خست.

## نەریتی میرمیرێن

یەکێک لە نەریتە دێرینەکان کە لە یەکەم ساڵی پاش رووخانی رەزاخان و رزگاری خەڵک لە زەبروزەنگی پەهلەوی لە مەهاباد زیندوکرایەوە نەریتی میر میرێن بوو. نەتەوەی کورد لەو کاتەوە دەستەڵاتە ناوچەییەکانی خۆی لە دەستدابوو و لە ژێردەستی و کۆیلەتیدا دەژیا بۆ زیندوو راگرتنی بیرەوەریی سەردەمی دەستەڵاتدارێتیی خۆی ئەم نەریتە کۆن و نەتەوەییەی لەکاتی نەورۆزدا بەرێوە دەبرد. لەم رێوەڕەسمەدا کەسێکیان بە ناوی "میر" هەڵدەبژارد لە ماوەی ئەم چەند رۆژە دەستەڵاتدارێتییەدا میر هەر فەرمانێکی دەرکردبا بێ ئەملاو ئەولا بەرێوە دەچوو، میر دوو وەزیر و دوو یاریدەدەر و میرغەزەب و تەڵخەک و ژمارەیەک دەستو پێوەندی هەبوو کە فەرمانەکانیان بەرێوە دەبرد. هەر لەو ساڵەدا بە هیممەتی لاوان شانۆی "میر میرێن" دەرهێنرا و بەرێوەچوو. بەرێوەچوونی ئەم شانۆیە هەستی خەڵکی زیاتر دەبزواند و نەیارانی تووڕە دەکرد. تەنانەت لە رۆژنامەکانی تاراندا دەنگدانەوەی بوو. کاربەدەستانی دەوڵەت و زۆربەی رۆژنامەکانی تاران بە ناڕەزایەتی و قەڵسی لە میری مەهاباد دوان و کوردەکانیان لۆمە کرد.

رۆژنامەی "کۆهستان" کە بە سەرپەرستیی ئیسماعیلی ئەردەلان لە تاران دەردەچوو و خوێنەریشی زۆر بوون لە سەروتارە بەناو بانگە کەی خۆیدا لەژێر ناوی (گاڵتە بەمیری مەهاباد مەکەن) و لێ کردبوو.

## رێکخستنی تەشکیلاتی پێشمەرگە

یەکێک لە گرنگترین کردەوەکانی مێژووی نەتەوەی کورد، پێکهێنانی هێزێکی رێکوپێکی نیزامی، بەناوی "هێزی پێشمەرگە" بوو. کە رۆژی ١٣٢٤/٩/٢٦ی.هەتاوی بۆ رێزگرتن لەم رووداوە گرینگە بەناوی "رۆژی پێشمەرگە" دیاری کراو.

هێزە نیزامیەکانی کوردستان کە هەتا ئەوکات پەرش و بڵاوو بەشێوەی چریکی بوون، رێکخران و نیزامیەکان واتە پێشمەرگەکانی کوردستان لە سەربازخانەی مەهاباد دا بەشێوەیەکی رێکوپێک و لە ژێر چاوەدێریی ئەفسەرە کوردە عێراقی و ئێرانییەکاندا دەستیان کرد بە راهێنان و مەشقی نیزامیی لاوانی کورد و بە لەبەر کردنی جلوبەرگی

قازی محەممەد، حاجی بابە شێخ و محەممەد حوسێن خان سەیفی قازی لە رۆژی نمایشی هێزی پێشمەرگە لە مەهابادا

تایبەتیی پێشمەرگایەتی بە شێوەی سەرنجراکێش و رێکوپێک لە سەرانسەری کوردستانی ئازاد دا دەستیان بەکارکردو بۆ پاراستنی

کوردستان و دەستکەوتەکانی نەتەوەی کورد ئامادەی گیان بەخت کردن بوون.

بە فەرمانی قازی محەممەد کە سەرۆکایەتی و فەرمانده‌یی هێزەکانی کوردستانی دەکرد و لەلایەن وەزارەتی هێزی پێشمەرگەوە (وەزارەتی بەرگری)، چوار سەرۆک عەشیرەت پلەی ژەنەڕاڵیان پێ درا کە بریتین لە:

١- حەمە حوسین خانی سەیفی قازی، وەزیری هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

٢- مەلا مستەفای بارزانی - سەرۆک عەشیرەتی بارزان

٣- حەمە رشید خانی بانە

٤- عومەر خانی شکاک - سەرۆکی عەشیرەتی شکاک

هەندێ لە فەرماندە سەربازییەکانی کوردستان

ریزی یەکەم: لە راستەوە بۆ چەپ محەممەد نانەوازادە، مستەفا خۆشناو، محەممەد حوسێن خان سەیفی قازی، مستەفا بارزانی، بەکر عەبدولکەریم، کاك مامەند کۆلیچ، موسا خان زەرزا ریزی دووەم: لە راستەوە محەممەد ئەمین شەڕەفی، بالأبەر ئەفسەری، میرحاج ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها، (لە دواوە محەممەد حوسێن خان و مەلا مستەفا) (١٣٢٤/ ١٩٤٥)

## کوردستانی سەربەخۆ لە ئازەربایجان

پێکهێنانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان زاڵبونی بەسەر ئازەربایجانی ژێر دەستەڵات و پشتیوانیی دەوڵەتی سۆڤیەت و دامەزرانی پەرلەمانی میللیی ئازەربایجان و گەرمبوونی دۆستایەتیی کوردستان و ئازەربایجان؛ یەک لە دوای یەک روخساری ناوچەکەیان بە تەواوی گۆڕی.

ئازەربایجانییەکان دەیانویست بە یارمەتی و پشتیوانی دەوڵەتی سۆڤیەت؛ دەست بە سەر هەموو ناوچەی ئازەربایجاندا بگرن کە بەپێی دابەشکاریی دەوڵەتی ئێران بەشێکی لە ناوچە کوردەکانیش دەگرتەوە. بەڵام ئەم "تێزە" لەگەڵ دژایەتی کردنی خەڵکی ناوچە کوردنشینەکاندا رووبەڕوو بۆوە. پاش دووجار سەفەری قازی محەممەد و وەفدی هاوڕێی بۆ باکۆ و چاوپێکەوتن و وتووێژ دەگەڵ میر جەعفەر باقرۆف؛ ئەم گەلاڵەیەی ئازەرییەکان جێی نەگرت و ناچاربوون پەیمانی هاوکاری و دۆستایەتی ببەستن.

قازی محەممەد پاش گەڕانەوەی لە دووهەمین سەفەری خۆی بۆ باکۆ؛ پەیوەندییەکانی لەگەڵ رێبەرانی ئازەربایجان چڕترکرد، تەنانەت لە رێورسمی دامەزرانی پەرلەمانی میللی ئازەربایجاندا لەسەر پێشنیاری رووسەکان چەند کەسێکی بۆ بەشداری لە دانیشتنەکانی پەرلەمانی ئازەربایجان ناردە تەورێز و بۆ خۆشی چەند جار بەمەبەستی هاوکاری و وتووێژ چووە تەورێز. هەتا بۆی لوا با لە پەیوەندیی لەگەڵ ئازەربایجان خۆی نەدەبوارد. لە دانیشتنێکدا کە لە کۆتایی ساڵی ١٣٢٤هەتاوی دا لە ناوەندی فەرهەنگیی ئازەربایجان و سۆڤیەت (Madanyat-êwy) لە باخی گوڵستانی تەورێز پێکهات

قازی محەممەد و حەمەحوسێن خانی سەیفی قازییش بانگهێشت کرابوون لەو دانیشتنەدا باسی مەسەلە و کاروباری ئێران و ئازەربایجان و پەیوەندیی کوردستان و ئازەربایجان هاتە گۆڕێ، نێردراوانی پایەبەرزی سۆڤیەت لە تەورێز لەوێ بوون. ئازەربایجانییەکان خوازیاری ئەوە بوون قسە و ویستەکان لەگەڵ حکوومەتی ناوەند بکرێنەیەک و لە بنەوە و بەنهێنی دەیانویست داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان و ویستەکانی تەشکیلاتی ئازەربایجان ببنەیەک و کوردستان ببێتە بەشێک لە ئازەربایجان. پێشەوا قازی محەممەد بۆ خوێندنی نوێژی شێوان وەدەرکەوت، پاش بە جێهێنانی نوێژەکەی گەڕایەوە و بە تێروتەسەلی باسی لە داخوازییەکانی نەتەوەی کورد و خەباتی چەند ساڵەیان لە پێناو ئازادیدا کرد و ئەو هەزاران شەهیدەی لێی کەوتۆتەوە و دژی ئەو بیبرۆکەیە وەستا کە پەیڕەوی لە ئازەرییەکان بکەن. بەڕێزیان هەروەها باسی لە تێکۆشانەکانی نەتەوەی کورد لە پێناو دەستەبەرکردنی ئازادی و مافی دیاریکردنی چارەنووس کرد و وەک بەڵگەش ئاماژەی کرد بە خەباتی نەتەوەی کورد لە تورکیا و عێراق کە لەلایەن ژەنەڕاڵی قونسوولی سۆڤیەتەوە، قسەکانی پەسەندکران. لەپاشان حەمە حوسین خانی سەیفی قازی محەممەد؛ ئاماژەی بە کورتەیەک لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کورد لە پێناو بەدیهێنانی ویستە نەتەوەییەکاندا کرد و زۆر بە سادەیی و خۆمانە رووی لە قولیۆف وەیس قونسولی سۆڤیەت کرد و گوتی: تۆ خوا مەماندەنە دەست ئەم و ئەو؛ لێمان گەڕێن سەر بەخۆو لەسەر پێی خۆمان راوەستین. قۆلیۆف و ئازەربایجانیەکان بەو قسەیە تێک چوون.

محەممەد بیریا وەزیری فەرهەنگی ئازەربایجان لەوەڵامدا گوتی: جەنابی سەیفی قازی؛ ئازەربایجانی خاوەنی قارەمان گەلێکی وەک: ستارخان، باقرخان و شێخ محەممەدی خیابانییە و ئێمە هەمیشە کوردەکانمان وەک برای خۆمان خۆش ویستووە.

شایەنی باسە؛ ئەم دانیشتنە بێ ئەوەی ئاکامێکی دڵخوازی لێ بکەوێتەوە کۆتایی هات.

## هاتنی بارزانییەکان بۆ مەهاباد

هاتنی بارزانییەکان و ئازادیخوازانی دیکەی کوردستانی عێراق بۆ کوردستانی رزگارکراو هیوا بەخش بوو. مەلا مستەفای بارزانی و عەشیرەتی بارزان و رووناکبیرانی دیکە و لایەنگرەکانی کە بۆ دابین کردنی ئازادی و مافی دیاری کردنی چارە نووسی کوردەکانی عێراق و رزگارییان لەژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عەرەب و دەست و پێوەندیٔ بەریتانیا خەباتیان دەکرد؛ بە هۆی هێرشی هێزەکانی عێراق کە راستەوخۆ لەلایەن بەریتانیاوە پشتگیری دەکران و لەبەر ئەوەی فڕۆکە جەنگیەکانی بەریتانیا هێزەکانی بارزانی و دێهاتەکانی بەو پەڕی دڕندییەوە بوردومان دەکرد، شۆڕشگێڕانی کوردو "عەشیرەتی بارزان"ی ناچار کرد نیشتیمانەکەیان بەجێ بهێڵن و پەنابەرنە بەرکوردستانی رزگارکراو و خاکی ئێران- سەرەڕای عەشیرەتی بارزان، ژمارەیەک لە ئەفسەرە کوردەکان کە خوێندنی نیزامییان لە کۆلێژەکانی ئەفسەریی عیراق و بەریتانیادا تەواو کرد بوو، هاتنە کوردستان.

عەشیرەتی بارزان لە ئاواییەکانی دەووربەری شنۆ، سولدوز، مەهاباد و بۆکان نیشتەجێ کران. شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا لە

پێشەوا و جەنەڕال بارزانی

مەهاباد گیرسانەوە و دواتر شێخ ئەحمەد چوونە نزیک شاری شنۆ و لە پاشان مەلا مستەفا بارزانی و هێزە چەکدارەکانی چوونە نێو هێزی پێشمەرگە و وەک هێزی نیزامیی بە ئەزموون و لێهاتوو بوونە پاڵپشتی حکوومەتی نەتەوەیی کوردستان.

## گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی (ژ. ك) بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان

لە دووهەمین سەفەری قازی محەممەد و هاوڕێکانی دا بۆ باکۆ و چاوپێکەوتن و وتووێژی لەگەڵ میر جەعفەری باقرۆفی، سەرکۆماری ئازەربایجان؛ وێڕای لێکدانەوەی بارودۆخی نێو نەتەوەیی باسی گوشاری دەوڵەتەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بۆ سەر وڵاتی سۆڤیەت لەبەر پشتگیری رووسەکان لە ئازەربایجان و کوردستان کرا و قازی محەممەد پاش گەڕانەوەی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی (ژ. ک) دانیشت و باسی لەوە کرد کە کوردستان بۆ ئەوەی بە دەستێکی ئاوەڵاترەوە

کاربکا و هەنگاوی بەجێتر و گونجاوتر هەڵگرێ، بە چەشنێک نەبێتە هۆی ورووژاندنی وڵاتانی ئێران و تورکیا و عێراق و هەروەها بۆ کەمڕەنگتر کردنەوەی دستێوەردانەکانی وڵاتانی بەرتیانیا و ئەمریکا و دژایەتی کردنیان لەگەڵ داخوازییەکانی نەتەوەی کورد، بڕیاریاندا لەو هەلومەرجە تایبەتەدا جارێ واز لە مەسەلەی کوردستانی گەورە بێنن (بێ دەنگەی لێڕاکەن) و بە وەرگرتنی خودموختاری لە چوارچێوەی ئەوکاتی ئێران دا و بە گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی (ژ. ک) بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستان و داوای دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان رازی و قایل بن. ئەگەرچی بەشێک لە هاوڕییان رازی نەبوون ئەم ناوە بگۆڕێن. بەڵام پاش لێدوانی قازی محەممەد لەسەر بارودخی سیاسیی ئەوکات و بە سەرنجدان بەو راستییە کە داوای سەربەخۆیی کوردستان لەوەها هەلومەرجێکدا لەلایەن هیچ هێزێکەوە، پشتگیریی لێ ناکرێ و ئەمریکا و بەریتانیا پشتیوانییان لە دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق دەکرد کە ئەم وڵاتانە دژی هەر چەشنە سیاسەتێک بوون کە- رای سۆڤیەتی لەسەر بوایە. هەروەها بەهۆی لاوازبوونی سۆڤیەت کە تازە لەژێر زەبری کاولکاری ئەلمانیای نازیدا هەستا بۆوە و لە بواری ئابووری و بژیو و چەکوچۆڵەوە تەواو چاوی لە دەستی ئەمریکا بوو و نەیدەتوانی یا نەیدەویست بە راشکاوی یارمەتیی کوردەکان بکاو لەوە زیاتر ئەمریکا و بەریتانیا بکا بە دوژمنی خۆی بۆیە ناچاربوون ئەم ناوگۆڕین و تاکتیک گۆڕینە، قبووڵ بکەن و پلان و ویستەکانی خەڵکی کوردستان لە هەشت بڕگەدا راگەیەندرا و لەخەزەڵوەری ١٣٢٤- ١٩٤٥ی. زاینی دا بەیاننامەی حیزبی دێموکرات کوردستان بڵاوبۆوە

و پاش هەفتەیەک یەکەمین کۆنگرەی نوێنەرانی حیزبی دموکراتی کوردستان لە مەهاباد پێکهات لەو کۆنگرەیەدا بەدەنگی نوێنەرانی بەشدار و سەرۆک عەشیرەت و کادری ناوەندیی حیزب و بە کۆی دەنگ قازی محەممەد وەک رێبەری حیزب و پێشەوای نەتەوەی کورد هەڵبژێردرا.

هەروەوها ساڵی ١٣٢٤ی.ه-١٩٤٥ی.ز هەڵبژاردنی خولی چواردەی مەجلیسی شورای میللی ئێران لە مەهابادیش وەک بەشەکانی دیکەی ئێران بەرێوەچوو. لەو هەڵبژاردنەدا جەنابی ئەبولقاسمی سەدری قازی برا گچکەی قازی محەممەد، وەک نوێنەری دەورەی چواردەهەم هەڵبژێردرا.

دانیشتووەکان لە راستەوە: خەلیل خوسرەوی، زەبیحی، قەدری جەمیل پاشا، قازی محەممەد، غەنی خوسرەوی، هەمزە تالوسی، مەناف کەریمی، وەستاوەکان لە راستەوە: رەئیس بەکر، رەحمان وەیسی، نەناسراو، مستەفا سوڵتانیان، نەناسراو، عەزیز مەنسوری، قازی وەهاب، عەلی خوسرەوی، محەممەدئەمین شەرەفی، دلشاد رەسولی، رەشید خوسرەوی، مەحمود وەلیزادە، مستەفا خۆشناو ١٣٢٤/ ١٩٤٥

## "کـــــۆماری کوردســـتان"

گرنگترین و بیۆێنەترین ڕووداوی مێژووی نەتەوەی کورد؛ دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بەدەستی بە توانای قازی محەممەد لە ٢ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ی.هەتاوی -١٩٤٥ی. زاینی دا بوو.[١٠]

لە بەشێکی دیکەی گۆڕەپانی چوارچرا ٣٠٠ پێشمەرگە بە کۆرسی موزیکی نیزامییەوە کە لە پێشیانەوە بوو لە چەندسەد مەتریی قازی محەممەدەوە ڕاوەستابوون، خەڵکی بێ ئۆقرەی ساتی هاتنی بەڕێزیان بوون. دوایی لە حاڵێکدا ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بە جلوبەرگی فەرمییەوە لە پشتەوەی قازی محەممەدەوە دەهاتن. بەهەنگاوی قایم و پتەو پێیان نایە گۆڕەپانەکە. قریوەی شادمانی بە چەپڵە ڕێزانی قایم هوڕای جەماوەر لەگەڵ دەنگی موزیکی مارشی نەتەوەیی ئاسمانی شاری تەنیبوو. لەو کاتە شارەوانی مەهاباد بە هەنگاوی قایم و پتەو هاتە پێشوازیی قازی محەممەد و پاش بەجێهێنانی ڕێورەسمی ڕێز و حورمەت، گوتی: من غەنی خوسرەویم پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەتان لێدەکەم کە بەدانی گەلێک قوربانی و چێشتنی ئازارو و بەهۆی لێزانی و لێهاتوویی ئێوەوە بەنەسیبی نەتەوەی کوردبووە. بە دڵێکی پاک و پڕ لە خۆشەویستی، پیرۆزبایی دەکەم لە پێشەوای نەتەوەی نەجیب و فیداکاری کورد و داوا دەکەم لە بەرێزیان لەو کاتە و ساتە مێژوویی و چارەنووسسازدا؛ بفەرموون بۆ کردنەوەی ڕێورسمی ئازادی و سەر کەوتنی نەتەوەی کورد.

بەو ئامادەکاری و جۆش و خرۆشەی لە چەند رۆژی پێشەوە دەبینرا؛ چاوەڕوانیی رووداوێکی گرینگ دەکرا. سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچە کوردنشینەکانو گەورەپیاوانی ناوداری ناوچە ئازاد کراوەکان، بانگ کرانە مەهاباد. دەگەڵ گەیشتنی نوێنەرانی ناوچەکان بۆ مەهاباد و دەربڕینی پشتیوانیی خۆیان لە دەستکەوتەکانی نەتەوەی کورد؛ رۆژی ٢ی رێبەندان گەیشت لە هەموو چین و توێژەکانی شار و دێهاتە نزیکەکان و هەروەها ئەو نوێنەرانەی لە هەموو شوێنێکی کوردستانەوە، هاتبوون لە مەیدانی چوارچرا و لە بەردەم کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکرات و نووسینگەی تایبەتیی قازی محەممەد کۆبوونەوە. لەم کۆبوونەوە بەشکۆ و دەیان هەزار کەسیەدا کە بە ئامادەبوونی بەرێزان، حاجی سەید عەولای گەیلانی زادە و مەلا مستەفای بارزانی، حاجی بابە شێخ، مەلا حوسینی مەجدی و مامۆستایانی ئایینی و هەموو سەرۆک و نوێنەرانی حیزب و عەشیرەتەکان لە سەرانسەری ناوچە ئازاد کراوەکان پێک هاتبوو، هەر هەمووشیان بەو پەڕی تاسە و جۆش و خرۆشەوە چاوەڕێی هاتنی قازی محەممەد بوون. پێشەوا قازی محەممەد بە جلوبەرگی نیزامییەوە و لە نێو شەپۆلی چەپڵە و هەستی ورووژاوی ئامادەبواندا، هاتە گۆڕەپانی چوارچرا. وێڕای سڵاو لە بەشدارانی ١٠ کۆبوونەوەکە" چووە سەر ئەو سەکۆیەی لە نێوەڕاستی مەیدانەکە بۆیان ئامادە کرد بوو. بەشداربوانی ئەم میتینگە بە شکۆیە و پێشمەرگەکان بە شێوەیەکی رێکوپێک و قوتابیانی قوتابخانەکان بە قریوە و شادمانی پێشوازیان لێکرد. قازی

محەممەد. لەوێوە رووی لە جەماوەری بەشداربوو کردو فەرمووی؛ بەنێوی خۆدا:

"کوردستان مەوقعیەتی جوغرافیایی مەخیۆیێ هەیە کە بێ پسانەوە و بێ ئەوەی تەتەوەو میللەتێکی کە لە نێویان فایێل و لێکیان بپچڕێتەوە کورد بە سەر یەکەوە و پێکەوە سکوونەتیان تێیدا هەیە و داوای مالکیەتی میللی لەوێدا. بەسەرهات و سەوابیقی تاریخیان یەکە و عموومەن تێیدا شەریکن. خاوەنی ئاداب و عادات و رسومی میللییەکی وان کە هیچ جۆرە سەدمە و حەوادیسێک نەیتوانیوە سستیەک لە بناغەی میللیەتی ئەوان دا پەیدا بکا.

کورد لە قەدیم دا هەزاران پادشا و حوکمدار و تەشکیلاتیان هەبووە. هەر لەم کوردستانە ئازادەی ئێستادا بنەماڵەی ئۆمەرای موکری کەسەر سلسلەی ئەوان ئەمیر سەیفدینا بووە تا (١٠٢٠ی کۆچی). بیلئیستیقلال یەک لە دوای یەک ئەمیر سەیفودین سارم بەگ، شێخ حەیدەر، ئەمیر بەگ، ئەمیر پاشا، تادەگاتە قوباد خان بە دەستەڵات و قودرەتەوە حکومەتیان کردووە.

میللیەتی رەشید و بەغیرەتی کورد لە هەموو دەورو زەمانێکدا هەر کەس خەیاڵی ئیستیلای نیشتیمانی ئەوانی بووبێ بەرەنگاری بوون و بەربەرەکانییان کردووە و لە هیچ فیداکارییەک دەستیان دانەنواندووە. لەپاش لەدەست چوونی حوکمداریشیان بۆ وەگیر خستنەوەی ئازادی وچانیان نەداوە. بەدڵێکی ئەوندە بەهێز و عەزمێکی ئەوەندە سابیتەوە تێکۆشاون تا ئێستا هێزێکی وانەبووە بتوانێ تێکڕا خەفەیان بکا. میرە کوێرەیان کوشتووە- بابان سەری

هەڵداوە. بابانیان بێدەنگ کردووە ئەردەڵان بڵندبوون- ئەوانیان لە عەرزی داوە بتڵیسی بەرز بوونەوە و هەزاری دیکەی وەک ئەوان.

تا لەو دواییانەدا لەپاش شەڕی بەینولمیلەلی پێشۆوە کە دیکتاتۆری ئێران و تورکیا هاتنە سەرکار زمان و عادات و مەزهەب و خسووسیاتی میللی کوردیان بە جارێک لاواز و کز و کەنەفت کرد. لە هیچ وەحشییەت و دڕندەییەک رانەوەستان خوێندن و نووسینی زمانی کوردی مەمنووع و پۆشینی لیباسمان قەدەغەبوو نەیاندەهێشت لە هیچ جۆرە مەزایا و حقووقێکی بەشەرییەت بەشمان بێ. رێگای فێربوونی عیلم و سەنعەتیان لێبڕیبووینەوە، هەر رۆژە بەهانەیەک و هەردەمەی تەشقەڵەیەک، دەستە دەستە و پۆل پۆل کوردی هەژار و بەدبەختیان حەبس و تەبعید دەکرد و دەیان کوشتن و لە بەینیان دەبردن حاسڵ و دەسڕەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و رووت و قووت دەهێشتەوە.

تا لە شەهریوەری ١٣٢٠ی. هەتاوی دا فریشتەی ئازادی دەسگای دیکتاتۆری و فاشیستی رەزاخانی تێک شکاند کورد سەری لەو هەمووە فشار و ئەزمییەتە کەمێ فارغ بوو. فەوری ئیحساسی کرد چۆن دەبێ لە فورسەت ئیستیفادە بکات و رێگای سەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چییە و چبکا. پیاوانێکی بە بیر و هۆش و بەشەڕەف کە زۆر لە مێژبوو خوێناوی دڵی خۆیان دەخواردەوە و بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دووکەڵ لە دەروونیان دەهاتە دەرێ، زۆر زوو تەشخیسیاندا کە وەختی کارە و لەو فورسەتە دەبێ بەهرە وەرگرێ و ئەوە تەواو ئەو رۆژەیە کە

پشتاوپشتیان چاوەڕوانی بوون. یەکجار و خێرا. بێ وەچان و راوەستان. دەستیان بەکارکرد. حیزبی دیموکراتی کوردستانیان تەشکیلدا و بەدەستوبرد خەریکی کاروباری میللی بوون و بە چاوێکی ورد و بە دیققەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیس دا و بەدی کرد. لە پێش هەموو ئیستیعمارچی و دیکتاتۆران بۆ ئیستیسمار و خواردن و کرۆساندنەوەی ئەو میللەتە بە قوولی خۆیان: (تفرقه بینداز و حکومت کُن) لەبەبینی خستبوون و تا ئەندازەیەک ئەو ئاورە بلێسەی ساند بوو برای دایک و بابی لەیەک بەزاندبوو یەکیەتی لە گۆڕێ هەڵگیرا وونیوی عەشیرەت و... هەرچی کە ئەسبابی ئەم نیفاق وپرش و بڵاوییە بوو فرێدرا و عوموەمەن لە ژێرعینوانی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا... یەک دڵ و یەک زمان... چەند مەدرەسەی کچان و کوڕانمان کردەوە. مەدرەسەی شەوانمان دیاریکرد و کتێب بە زمانی کوردی تەرجەمە کران کوڕ و کچ و پیاوی گەوەرە لە مەداریسی شەوانە و رۆژانە بە زمانی کوردی دەخوێنن لە جیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربوونی فارسی بن لە مانگێک و دوومانگدا دەبنە خوێندەوار و هەموو شتێک دەخوێننەوە و دەنووسن. بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کورد و بۆ راگەیاندنی هاواری خۆمان بە گوێی دنیای بەشەرییەت و عەداڵەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بڵاوکردنەوە بووین، چاپخانەی زۆر چاک تەئسیس کرا و دانرا لە شاری خۆماندا بە زمانی خۆمان بە چاپخانەی خۆمان گۆڤار و رۆژنامە دەردەچێ و بیر و فکر و داخوازیی ئێمە لە دنیادا بڵاودەکاتەوە.

حاسڵ و بەروبووی ئێمە کە میقدارێکی زۆر و زەوەند و بە قیمەت بوو بە فیرۆیی لە دەستیان دەردەهێناین و دەستی ئیستیعمار سەددێکی لە پێش ئێمە و بازاڕی دنیا دروست کرد بوو. رێگای حەلمان دییەوە و تیجارەت و ئیقتیسادی کوردستان زۆر باش تەئمین کرا.

لە زەمانی دیکتاتۆریدا کە هەموو عەوارێزێکییان لێ دەستاندین کەم و زۆر وەسیلەی لەشساغی و موعالەجە، نە حەکیم. نە دەرمان نە نەخۆشخانەی بۆ ساز دەکردین. ئێمە بۆ خۆمان نەخۆشخانەی زۆر باش بەو زووانە دایر دەکەین و لەشساغی وڵاتمان تەئمین دەبێ.

هێزێکی میللیمان تەشکیل داوە کە بە شەجاعەتێکی تەواو حازرە دیفاع لە نیشتیمان بکا.

دیارە مووەفەقیەتی ئێمە سەراسەر لە عەینی مەرامی دیموکراسی و لە نەتیجەی فەعالییەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بە پشتیوانیی عالەمی دیموکراتە لەبەر ئەوە... دەڵێین: بژی موئەسیسینی دیموکرات. میللەتی کورد هەزاران سەد و بەرهەڵستی سەخت و سەهەندەی لەڕێدابوو دەستە و دایەرەی دیکتاتۆریی؛ بێ وچان کارشکڵنی ئێمەیان دەکرد و لە هیچ نامەردییەک رانەدەوەستان. ئیختیلافاتی عەشایر بۆ داخلیش ئیشکالێکی گەورە بوو بۆ ئێمە. ئەمما ئەوانە هیچ کامێکیان نەیانتوانی پێش بە ئێمە بگرن. بە دڵێکی بەهێز پایەداریمان کرد و ئیدامەمان بە فەعالیەتی خۆماندا تا ئیستقیلال و ئازادی نەتەوەی کوردستان بە دەست هێنا.

دیارە بە قایایەکی ئەو خەتەراتەش کە ماوە چ لە داخلّدا و چ لە خاریجدا میللەتی کورد موبارەزەی خۆی لەگەڵیان ئیدامەپێ دەدا بە پشتیوانیی خودا موزەفەرو ئەوڕۆکە نومایندەکانی تەواوی نەواحی و نوقاتی کوردستانمان بێ ریعایەتی تەبەقات و ئەعەم لە ئاغا و رەعییەت، گەورە و بچووک، کۆبوونەوە و یەکدڵ و یەکزمان هاواری دیموکراسی دەکەن و بەڕێی دیموکرات دادەڕۆن قودرەت و و قوەتی دیموکرات نیشان دەدا*.

قسەکانی قازی محەممەد لە نێوان چەپڵە و هوڕای شادمانیی بەشداربوان و تەقەی پێشمەرگەدا کۆیایی پێهات. لە پاشان حەمە

قوتابییان و مامۆستایان لە گۆڕەپانی چوارچرا

(گۆڕەپانی شارەوانی) ١٣٢٥/ ١٩٤٦

---

* دەقی قسەکانی پێشەوام لە کتێبی جەمهووریەتی کوردستانی "مەحموودی مەلا عیزەت" دابەزاند و بەجێی وەرگێڕانی دەقی کتێبەکەی بەڕێز هومایون کەڵکم لێوەرگرت (وەرگێڕ).

حوسێن خانی سەیفی قازی، فەرماندەی هێزی پێشمەرگە و ژمارەیەکی دیکە لە ئەندامانی حیزب و سەرۆک عەشیرەت و نوێنەری ژنان قسەیان کرد.[١١] ئەوجا رێورەسمی رێزی نیزامی (سان و رژە)ی قوتابیانی قوتابخانە و هێزی پێشمەرگە لە بەردەم پێشەوا و میوانەکاندا بەرێوە چوو و لە نێو قریوە و چەپڵەڕێزانی خەڵک دا کۆتایی پێهات. لە پاشان بۆ ماوەی چەند سەعات بەشداربوان کردیان بە هەڵپەڕکێ و سەما و مانگ و حەوتوان رێوڕەسمی جەژن و شادی لەسەراسەری کوردستاندا لەلایەن چین و توێژە جۆراوجۆرەکانەوە بەردەوام بوو..

هەر ئەم رۆژە وێڕای راگەیاندنی کۆماری خودموختاری کوردستان و بەپێی را و ویستی بەشدارانی ئەم کۆبوونەوە بەشکۆیە قازی محەممەد کرابە سەرۆک کۆماری کوردستان.

## بڕیارنامەی میتینگ:

پاش گەلێک قسە و ئاخافتن و خوێندنەوەی شیعر لەلایەن دووشاعیری نەتەوەیی کورد هەژار و هێمن و رێوڕسمی (سان و رژە) بڕیارنامەی میتینگ لە شەش بڕگەدا خوێندرایەوە و لەلایەن بەشداربووانەوە پەسندکرا:

ئێمە نوێنەرانی هەموو چین و توێژی کوردەکانی باکووری کوردستان ویستەکانی خۆمان رادەگەیەنین و داوا لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و ئەنجومەنی میللی کوردستان دەکەین و ئیختیاری پیدەدەین کە:

١- لەو ناوچانەی ئێستا کوردیان تێدایە، ئازادییەکی ڕێژەیی هەبێ.
٢- هەڵبژاردنی مەجلیسی شۆرای میللی (پەرلەمانی جڤاتی نەتەوەیی) پێک بێ.
٣- حکوومەتی میللی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیران و ئیدارات پێک بێ.
٤- هێزی پێشمەرگە لە ناوچە کوردنشینەکاندا دابمەزرێ.
٥- پەیوەندیی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ دابمەزرێنێ.
٦- پەیوەندیی دۆستایەتی و برایەتی لەگەڵ ئازەربایجان پتەوتر بکەن. لەکۆتایی قسەکاندا کاتێک وەک سەرکۆماری کوردستان ناوی قازی محەممەد هات. مووزیکی میللی لێدەدرا و چەپلەڕێزان و قریوەی شادمانی خەڵک و منداڵە قوتابیان کە سروودی میللی یان دەخوێند دەگەیشتە ئەوپەڕی ئاسمان.

## ڕێوڕەسمی سـەرکـۆمـاری

لەو ڕێوڕەسمەدا قورئانی پیرۆز و ئاڵا و نەخشەی کوردستان کە لە سەردەستی مەلا حوسێن مەجدی بوو و هەیئەت ڕەئیسەی حیزب لە دواوەی دەهاتن؛ هێنایان و قازی محەممەد بۆ خۆی روپۆشەکەی لەسەر قورئان و ئاڵاو نەخشەی کوردستان لادا و ئایینی سوێند خواردنی هێنا:

ئەمن بە خودا، بە کەلامی عەزیمی خودا، بەنیشتیمان، بە شەرافەتی میللەتی کورد، بە ئاڵای موقەددەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخر هەناسەی ژیانم و ڕژانی دوایین تنۆکی خوێنم

بەگیان و ماڵ لە رێی راگرتنی سەربەخۆیی و بەرزکردنەوەی ئاڵای کوردستاندا تێ بکۆشم و وەفاداربم بەسەرۆکایەتی کۆماری کوردستان و هاوکاریی کوردستان و ئازەربایجان).

سەرۆک عەشیرەتەکانی بەشداری میتینگەکەش سوێندی وەفادارییان بەکوردستان و کۆمار و پێشەوا خوارد و لە کۆتایی رێورەسمەکەدا کۆڕی هەڵپەڕکێ و شایی گەرم بوو کاک غەنی خوسرەوی شارەداری مەهاباد پێشەوا و سەرۆک عەشایر و پیاو ماقووڵانی بانگهێشت کرد بۆ سالۆنی کۆبوونەوەکانی (کۆمیتەی ناوەندی) و ئەوجا پۆل پۆل نوێنەری هۆز و عەشیرەتەکانی کوردستان و لقەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و نوێنەرانی شار و دێهاتان بۆ پیرۆزبایی و (بیعت)[١٣] هاتنەلای قازی محەممەد و پەیمانی وەفاداری و فیداکارییان نوێ کردەوە و دەنگی بژی کودرستان و سەرۆک کۆماری کوردستان دەچووە ئەوپەڕی ئاسمان. زۆربەی بەشداران خۆیان پێ رانەگیرا و لە خۆشیان دەگریان. هەتا ١٢ی شەو خەڵک هەڵپەڕین و لە خۆشحاڵییان نەیاندەویست بڕۆنەوە ماڵێ.

## پێکهێنانی هەیئەت رەئیسەی میللی کوردستان

چەند رۆژێک پاش جەژن و شادمانی بەبۆنەی دامەزراندنی کۆماری کوردستانەوە، ئەندامانی هەیئەت رەئیسەی میللی هەڵبژێردران، کە بریتی بوون لە:

١- سەرۆک وەزیران - حاجی بابەشێخی سەیادەت
٢- وەزیری بەرگری - حەمە حوسین خانی سەیفی قازی
٣- وەزیری نێوخۆ - حەمەدەمین موعینی
٤- وەزیری ئابووری - ئەحمەدی ئیلاهی
٥- وەزیری پۆستە و تەلەگراف؛ - کەریم ئەحمەدین
٦- وەزیری فەرهەنگ - مەناف کەریمێ
٧- وەزیری تەبلیغات - سەدیق حەیدەری
٨- وەزیری بازرگانی - حاجی مستەفا داودی
٩- وەزیری کار - خەلیل خوسرەوی
١٠- وەزیری کشتوکاڵ - مەحموود وەلی زادە
١١- وەزری رێگەوبان - ئیسماعیل ئیلخانی زادە
١٢- وەزیری تەندروستی - سەید محەممەد ئەیووبیان
١٣- وەزیری راوێژکار - عەبدالرحمن ئیلخانی زادە
١٤- وەزیری عەدل - مەلا حوسێن مەجدی

شایانی باسە؛ بۆ پووچەڵکردنەوەی تەبلیغات و پڕوپاگەندەی دوژمنان و دڵنیاییدان بە دەوڵەتی تاران لە هەرچەشنە گومانێکی جوداییخوازیی کوردەکان؛ هەیئەتی دەوڵەتی کوردستان بە ناوی هەیئەت رەئیسەی میللی و وەزیران ناوی سەرۆک دەزگاکانیان لێ نرا.

هەیئەت رەئیسەی میللی، بەو پەڕی دڵگەرمی و دڵسۆزییەوە دەستی بەکارکرد. پاشان ئەوکەسانەی بەنوێنەرایەتی کوردەکانی تورکیا و عێراق و سووریا بۆ پیرۆزبایی هاتبوون؛ هاودەنگی و پشتیوانیی خۆیان لە کۆماری خودموختاری کوردستان دەربڕی[١٢]

کۆمەڵێك لە کاربەدەستانی کوردستان لە راستەوە بۆ چەپ ریزی یەکەم: محەممەد یاهو، خەلیل خوسرەوی، محەممەدئەمین شەرەفی، غەنی خوسرەوی، مستەفا سوڵتانیان، سەید محەممەد ئەیووبیان، وەهاب بلوریان ریزی دووەم: عەلی ریحانی، نەناسراو، ئەحمەد ئیلاهی، سەعید هومایون، مەنافی کەریمی، کەریم ئەحمەدیان، دلشاد ردسوڵی، رەحیمی لەشکری، میرزا وەهابی قازی

پێکهێنانی کۆماری خودموختاری کوردستان. بە بەشداریی وەزیرانی چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ دوژمنانی نەتەوەی کوردی توورە کرد و رووبەڕووی رووداوێکی چاوەڕوان نەکراوی کردنەوە و کارشکێن ی و فێڵ و تەڵەکە و تەشقەڵەکانی لێ خستنە روو. بەڵام قازی محەممەد بەپشت گەرمیی میللەت و بەئیمان بە رەوایی ویستەکانی خەڵک، بەوردبینی و واقیعبینییەوە لەگەڵ

کێشەکان رووبەڕوو دەبۆوە بۆ ئەوەی کارشکێنی و دوژمنایەتیی ئاشکرا و نهێنیی دوژمنان، نەبنە کۆسپی سەر رێگەی پێشکەوتنی کاروباری دەوڵەتی ساوای کۆماری کوردستان.

## هــەڵكردنــی ئاڵای كــوردســـــتان

یەكێك لە رووداوە گرینگەكانی پاش دامەزراندنی حیزب، هەڵكردنی ئاڵای كوردستان بوو ئەو ئاڵایە لە سێ ڕەنگی سوور،

رێورەسمی هەڵكردنی ئاڵای كوردستان ١٣٢٤/ ١٩٤٥

لە راستەوە: مەحمود وەلی زادە، مەنافی كەریمی، سەعید هومایون

سپی و سەوز پێکهاتبوو کە هێمای خۆر و قەڵەم و دوو چەپکە گوڵ لە رەنگە سپی یەکەیدایە. رۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی.هەتاوی/١٩٤٥ی.ز لە رێورەسمێکی تایبەتدا و بە ئامادەبوونی هەزاران کەس لە خەڵکی مەهاباد و شارەکانی دەوروبەر لە نێوان کەفو کوڵی خەڵک و رێزی قوتابیانی کوڕ و کچی مەهاباد و نوێنەرانی حیزبی دیموکرات ئاڵاکە هەڵکرا. پاش قسە بە نرخەکانی قازی محەممەد، بۆ یەکەمجار ئەم ئاڵایە لەسەر بینای هەیئەت رەئیسەی میللی کوردستان هەڵکرا و پێشمەرگەکان لە خۆشیانا چەند تفەنگیکیان هاوشیت. رۆژەکانی دواتر؛ وێڕای هەڵپەرکێ لە بۆکان و نەغەدە و شنۆ و زۆر دێهاتی گەورەش، ئاڵای کوردستان هەڵکرا و کەفو کوڵ و شادمانیی خەڵک گەیشتە لوتکە و لە هەرشار و ئاواییەک کۆڕ و کۆبوونەوەی خۆشی و نوتق و ئاخافتن پێکهات. بەڕاستی قەڵەم کۆڵە لە باسکردنی ئەو هەموە شادمانییە.

لەو رێورەسمانەدا. رۆڵەکانی کورد لەناخی دڵەوە رێز و حورمەتی خۆیان بۆ پێشەوا دەردەبڕی[١٢]

## پێکهێنانــی کـۆمیتەی ژنان

هاوکات لەگەڵ رابوون و وشیاریی گشتی کە وێڕای بزووتنەوەی دیموکراتێکی خەڵک لە کوردستان هاتبووە ئاراوەبە پێی ئەو شارەزاییەی کە رێبەرانی کورد لەمەڕ پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووە ئەورووپییەکان هەیان بوو، بۆیان دەرکەوتبوو کە ژنان نیوەی کۆمەڵیان پێک هێناوە و نەتەنیا نابێ

ئەو هێزە مەزنە لە ماڵەکاندا بەند بکرێن، بەڵکوو پێویستە زەمینەی پەروەردە و راهێنانیان لە ناوەندە پەروەردەیی و فێرکارییەکاندا بۆ دابین بکرێ و لە بەشە جۆراوجۆرەکانی ئۆرگان و رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانیان بەهرەمەندبن بۆ یەکەمجار لە کوردستانی ئێراندا کۆمیتەی ژنان لە شاری مەهاباد دامەزرا بەمجۆرە ژمارەیەکی زۆر لە ژنان، وێڕای شارەزایی لە مافە پێشێڵ کراوەکانیان، هاتنە نێو پرۆسەی چالاکی و کاروباری کۆمەڵایەتی وەک: مامۆستایەتی؛ رۆژنامەڤانی و خزمەتی دەرمانی و لە رێورەسم و جێژنە و بۆنەکاندا، قسەیان کرد و سروودیان چڕی و هونەریان نواند.(١٣)

### کردنەوەی (دایرکرنی) قوتابخانە بۆ جوولەکەکان لە مەهاباد

سالی ١٣٢٤/١٩٤٥ هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی قوتابخانە و بەڕێوەبردنی گەلێک چالاکیی دیکەی فەرهەنگی لە مەهاباد، قوتابخانە بۆ مندالانی جوولەکەی نیشتەجێی ئەم شارەش دەستەبەرکرا. بۆ ئەوەی زمانی زگماکیی خۆیان فێربن و لە هەموو قۆناغەکانی فێرکاری و پەروەردەیی‌دا لەگەڵ قوتابیەکانی دیکەی نیشتیمانیان یەکسان و بێ جیاوازی بن.

هەروەها هەرکاتێک رێبەری مەزهەبیی یەهوودییەکان کە پێیان دەگوت "مالم" بۆ چاوپێکەوتن دەهاتەلای قازی محەممەد؛ بەو پەڕی رووگەشییەوە وەری دەگرت و بەناوی موعەلیم باشی بانگی لێدەکرد و هەرکارێکیشی بوایە بۆی جێبەجێ دەکرد(١٤)

## یەکەم تێکهەڵچوونی نێوان پێشمەرگە و سوپای شا.

رۆژی ١٣٢٥/٢/٩ی.هەتاوی بەرامبەر/١٩٤٦ هێزێکی سەربازیی حەوت سەت کەسی بە پشتیوانی تۆپخانە و چەندین تانک (دەبابە) و فرۆکەی شەڕکەر هێرشیان کردە سەر مەتەرێزەکانی پێشمەرگە لە نزیکیی بانە- ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی بارزانی کە لە ژێر

عەلی بەگ شێرزاد فەرماندەی هێزی پێشمەرگە لە بۆکان

فەرماندەیی سەرهەنگ مستەفا خۆشناودا لە دەوری ئاوایی مامەشا (رێگەی بانە- سەقز) سەنگەریان گرتبوو و بەرگرییان لەو ناوچەیە دەکرد. لە زەوی و ئاسمانەوە کەوتنەبەر پەلاماری ئەرتەش. بەڵام

بە خۆڕاگریی قارەمانانەی پێشمەرگەکان هێرشەیەک لەدوا یەکەکانی ئەرتەش تێک شکان و ئەرتەش پاش ئەوەی سەت کەسی لێ کوژرا و ٣٠ کەسی لێ بە دیل گیرا و تانکێکی لێ ئەستێنرا ناچار بوو پاشەکشێ بکا.

حکوومەتی کوردستانیش بۆ دیفاعی زیاتر و پێشگری لە هێرشەکانی ئەرتەشی شا لە ناوچەی سەقز داوای لە عەشیرەتە چەکدارەکان کرد، کە ئامادەی بەربەرەکانی بن و لە ناوچەکانی خۆیانەوە بەرەو مەهاباد و سەقز وەڕێ بکەون. سوارچاکانی عەشیرەتەکان بە دەنگی ئەو داوایەوە هاتن و پۆل پۆل بەرەو مەهاباد کەوتنەڕێ بۆ بەهێزتر کردنی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بۆ دەوروبەری سەقز و بانە بەڕێ کران. ئەم هێزان بەو پەڕی دڵسۆزی و هۆگری و بە ئیمانێکی پتەو بە سەرکەوتن؛ ئامادەیی پێویستیان بۆ رۆیشتن بەرەو باشوری کوردستان و تەنانەت گرتنی سەربازخانەکانی سەردەشت، سەقز و بانە: پیشان دا و.

بەڵام قازی محەممەد و کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان، حەزیان لەوە نەبوو بەشەڕ و کوشت و کوشتار بەمافی کوردەکان و خودمختاری بگەن، ئەوان لایەنگری ئاشتی و پێکهەڵکردن و پێکهاتن بوون لە رێگەی وتووێژ و مافی دیاریکردنی چارەنووس، بۆ خەڵکی کوردستان. بۆ سەڵماندنی ئەم وتەیە ئاماژە دەکەم بە وەڵامی نامەکەی قازی محەممەد بۆ ژەنەڕاڵ حەمە رەشیدخان فەرماندەی هێزی کوردستان لە ناوچەی سەقز و سەرا و بۆکان - جەنابیان لە وەڵامی نامەی حەمە رەشیدخاندا کە ئیزنی هێرش و پێشڕەویی بۆ سەر هێزەکانی ئەرتەشی شای خواستبوو، نووسیبووی:

ئاغای فەرماندەی هێزی بۆکان و مەنتیقەی سەرا. لە جوابی نامەی ژمارە ١٣٢٥/٣/١٥/٤٧١دا. هەرکارێکی جوزئی ئەلان دەبێ لەگەڵ ئەوزاعی بین المللی تەتبیق بکرێ چ جار کاری مەکە کوللی یە (گشتی) بۆئەوەی ئێمە مەجبوورین لەڕێی سوڵحەوە تا مومکین بێ ناتوانین بەڕێی دی دا بڕۆین ئەو تاخیرە ئی وەیە دەنا ئەمن لە تۆ بەپەلە ترم*. ئەوانەی خودا خودایان بوو بشێوێ؛ یا ئەوانەی ئێستا کە پاش ٥٠ ساڵ ئەم شتە تاوتوێ دەکەن، بەڵام هەلومەرجی دژواری کاری ئەو دەم لەژێر دەستەڵاتی هێزەکانی سێ دەوڵەتی داگیرکەر و هاوپەیمانی جاران و دوژمنی دوایی دا و خۆڕانەگرتنی هێزەکانی عەشیرەتەکان و نەخوێندەواری و نەبوونی زانیاری سیاسیی خەڵک لەسەر هەلومەرجی قەیراناوی و کەسەرباری ئابووری و زۆر گرفتی دیکە لە بەرچاوناگرن یا تەنانەت هێندێ لە لایەنگرانی دیموکراتیش رەخنەدەگرن کە بۆچی پێشەوا قازی محەممەد فەرمانی هێرش و پێشڕەویێ دەرنەکرد؟ لایەنی دەرەکیی دژبەریی راشکاوانەی بەریتانیا و ئەمریکا، تورکیا و عێراق و لایەنیی نێو خۆیی وەک دوژمنایەتی توندی دەوڵەتی ئێران و ناڕاستیی سۆڤیەت و ئازەربایجانیان دەبێ لەبەرچاو بێ. لە لایەکیشەوە، فریو خواردنی هێندێ عەشیرەت و پەیوەندی گرتنیان بە دەوڵەتی شاوە هۆیەکی دیکەبوو. ئەوانە کە لە سەرەوە لەگەڵ بەڵێنی بە درووینەکانی دەوڵەت و سوپا بوون و لەگەڵ پێشڕەوییەکی کەمی سوپای شا بەرەو بۆکان پتەیان کەوتەسەر

---

* دەقی نامەکەی پێشەوا- سەرچاوە جمهووریەتی کوردستان مەحموودی مەلا عیزەت.

ئاو. چەند کەسێک لە عەشیرەتی دیپۆکری بەمەبەستی هاوکاری و یارمەتیی سوپا و تێکدەریی، پردە دارینەی بۆکان بەرەو مەهابادیان ئاوردا و گەلێک نامەیان کەوتە دەستی بەرپرسانی کوردستان کە تێیدا بەڵێنی هاوکاریان بەدەوڵەتی ناوەندی دابوو. بەمجۆرە پیلانەکانیان لێ ئاشکرابوو. لەلایەکی دیکەشەوە؛ دژایەتی کردنی سۆڤیەتیەکان لەگەڵ هێرشی کوردەکان بۆسەر هێزەکانی شا کە پێشتریش ئاماژەی پێکراوە لەو هۆکارانەن کە رێگربوون لەبەردەم پێشڕەوی بەرەو شارەکانی تری کوردستان. دەنا هەروەک بەرێزیان لە نامەکەیاندا بۆ حەمە رەشیدخان ئاماژەیان پێکردووە، ئەو لایەنانەی لەبەر چاو بووە بەڵام بە وردبینییەوە هەلومەرج و دۆخی نێو نەتەوەیی و ناوچەیی لێکدا بۆوە و چاوەڕێی دەرفەتێکی گونجاو بوو.

## "وتووێژەکانی سەقز و تاران"

نوێنەرانی کوردستان و سوپای شا چەندین جار لەبەرەی سەقزدا بۆ وتووێژ دانیشتن و لە هێندێ لەو دانوستانانەدا، سەر لەشکەر رەزم ئارا، سەرۆک ستادی سوپاش بەشداربوو. هەروەها لەو چاوپێکەوتنانەی لە نێوان رەزم ئارا و سێ کەس لە نوێنەرانی کوردستان و ئازەربایجان لە تاران کران، قەرار و بڕیارگەلێک لەسەر هێرش نەکردنی هێزی پێشمەرگە و ئیزنی هاتووچۆی کاروانی خواردەمەنی بۆ سەربازخانە گەمارۆدراوەکانی بانە و سەردەشت و میرەدێ؛ دانرا و دواتر هەیئەتێک (شاندێک) لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بە سەرۆکایەتیی موزەفەری فیروز جێگری

سەرۆک وەزیر قەوام سەلتەنە بۆ درێژەی وتووێژەکان نێردرایە تەورێز. بەڵام هەموو ئەم بەرنامانە بۆ دەرفەت وەرگرتن و بەهیوای دۆزینەوەی ڕێگا و ڕەخسانی دەرفەتێک ڕێکخران بۆ هێرشکردنە سەر ئازەربایجان و کۆتایی هێنان بە بزووتنەوەکان لەلایەن سوپاوە. هەڵبەت زۆربەی ئەم وتووێژانە بێ ئاکام دەمانەوە و پاش چەند ڕۆژێک سەرلەنوێ دەستیان پێدەکردەوە.

## دووهەمین تێك هەڵچوونی پێشمەرگە و ئەرتەشی شا

دانوستانەکانی موزەفەری فیروز لە تەورێز سوپاگەڵ نوێنەرانی کوردستان و ئازەربایجان لە ڕۆژی ١٩٤٦/١٣٢٥/٣/١٢ی.ز دا دەستیان پێکردەوە، سوپای شا هەلی بەدەرفەت زانی و ڕۆژی ١٣٢٥/٣/٢٥/ دیسان بە خەیاڵی کردنەوەی ڕێی سەقز- بانە و شکاندنی، گەمارۆی سەقز و سەربازخانەکانی تر لە کوردستان، بەسێ هەزار کەس هێزی نیزامی و بە پێشتیوانیی ٨ مەفرەزە تۆپ و دوو فڕۆکەی شەڕ و دوو تانک هێرشیان کردەوە سەر سەنگەری پێشمەرگەکانی کوردستان لە تەپەی مامەشا. هێرشەکە لە سەرپێشنیاری ڕەزم ئارا و بەفەرمانی "قەوام" بەمەبەستی کردنەوەی ڕێی سەقز- بانە بەڕێوەچوو. لە سەنگەری مامەشادا ٣٩ کەس لە پێشمەرگەکانی بارزانی لە بەردەستی (فەرماندەیی) سەرهەنگ مستەفا خۆشناو دابوون و دواتر ٣٠ پێشمەرگەی تری هێزی سەرهەنگ میرحاج هاتنە یارمەتییان. ئەرتەشیەکانی شا لە بەیانیدا هەڵیانکوتایە سەر سەنگەری پێشمەرگەکان و شەڕێک

نابەرابەر لە ژێر پشتیوانیی فڕۆکە و تانک و تۆپخانەدا بەسەر پێشمەرگەدا سەپا.

شەڕێک کە دەکرێ بڵێنین لە مێژووی شەڕی رێکوپێک و چریکی‌دا بێوێنە بوو. لە لایەکەوە سوپاییکی رێکوپێک و تەیار بە تۆپخانە و فڕۆکە لەلایەکی دیکەوە ژمارەیەکی حەفتا کەسی کە تەنیا بە تفەنگێک و یارمەتیی خودا و ئەوینی کوردستان تەیار بوون، رووبەڕووی یەک بوونەوە و ئەم شەڕە نابەرابەرە بە هێرشی پەیتا پەیتای هیزە چەکدارەکانی شا ماوەی چەند سەعات درێژەی کێشا و لە ئاکامدا ورە و بوێریی لەرادەبەدەری کۆڵنەدەرانی فیداکاری کورد، هێرشەکەیان سوپای سەرکوتکەر یان تێک شکاند و سوپای شا پاش ئەوەی ٥٠٠ کەسی لێ کوژرا و فڕۆکەیەکی کەوتە خوارێ و تانگیک و ٢٥٠ کەسی لێ بەدیل گیرا بەرەو مۆڵگەی سەربازەکانی لە سەقز پاشەکشەی کرد.

جێی خۆیەتی ئەم شەڕ مێژووییە لەلایەن توێژەرانی نیزامییەوە بخرێتەبەر توێژینەوە. رۆژی هێرشەکە و تێکشکانی سەرشۆڕانەی سوپا پێشەوا قازی محەممەد لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتی ئازەربایجان سەبارەت بە دانوستان لەگەڵ نوێنەرانی تاران خەریکی لێدوان و وتووێژبوو. لەگەڵ ئاگاداربوون لەو هێرشە و شکستی سەرشۆڕانەی سوپا؛ رۆژی ١٣٢٥/٣/٢٦ی.ه/١٩٤٦ی.زاینی گەڕاوە بۆ کوردستان و لە ڕێی میاندواو را یەکسەر بەرەو (بارەگا) فەرماندەیی کە لە ئاوایی سەرا بوو وەڕێ کەوت. ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی و چەند فەرماندەیەک کە بۆ پێشوازیی قازی محەممەد هاتبوونە میاندواو؛ لەگەڵی بەرەو بەرەی شەڕ وەڕێ کەوتن و

ژەنەڕاڵ بارزانیش هەر لەو ئوتومبێلەدا (سواریوو) کە ئەوەی تێدا بوو، مبیش لە گەلیان بوو. لە ڕێگادا ژێنراڵ بارزانی وێڕای ئەوەی باسی لە قارەمانەتیی پێشمەرگەکانی لەو شەڕەداکرد ئاماژەشی بەبریندارببوونی چەند پێشمەرگەیەکی بارزانی کرد کە یەکێک لەوان خەلیل خۆشەوی بوو. پێشەوا گوتی: جەنابی بارزانی، ئێوە ناوی بریندارەکانتان پێگەییوە؛ ژێنراڵ بارزانی گوتی: نەخێر- بەڵام چۆن ئەوکەسانە لە نزیکەوە دەناسم و لە بوێری و نەترسییان رادەبینم؛ دەزانم هەمووان لاو و نەترسن لەوانەیە بریندار بووبێتن. کاتێک گەیشتینە شوێنی مانەوەی پێشمەرگەکان لە بۆکان و چووینە سەردانی بریندارانی شەڕی مامەشا، پێشەوا قازی محەممەد و ژێنراڵ بارزانی لە بریندارەکانیان پرسی و ڕێزیان لە لێبوردەیی و بوێرییان گرت. سەیر ئەوەیە ئەوکەسانەی ژێنراڵ بارزانی نێوی هێنابوون هەر هەمووان بریندار ببوون کە بەداخەوە خەلیل خۆشەوی و دووکەسی دیکە بەهۆی کاری بوونی برینەکانیان شەهید ببوون.

## "ئاگربەست (تەقەوەستاندن)ی هێزەکان"

سەرلەشکەر ڕەزەم ئارا لە ئاوایی سەرا بە پێشوازیی پێشەوا قازی یەوە هات و بەو پەڕی دووڕوویییەوە سەبارەت بەو کارەساتە داخ و کەسەری دەربڕی و لە سەر تەقە وەستاندن و دووپاتە نەبوونەوەی شەڕ بەتێرو تەسەلی قسەیان کرد. پێشەوا قازی محەممەد قایل بوو بەوەی ئێزن بدرێ هێزە چەکدارەکانی شا خواردەمەنی و بژیو و جلوبەرگی نیزامی ئەویش لە ژێر

چاوەدێریی پێشمەرگەدا ببەن بۆ هێزە گەمارۆدراوەکانی میرەدآ و بانە و سەردەشت.

ئەوجار ناردنی چەکو تەقەمەنی و راگواستنی پێداویستی شەڕ و هێنان و بردنی سەربازانی سوپا (یاساخ) (قەدەغە کرا بێجگە لە بریندار وزەخمی) واش دانرا هەر کاتێک هێزەکانی سوپا پێچەوانەی ئەم رێکەوتننامەیە جووڵانەوە، پێشمەرگەکانی کوردستان مافی پێشگیری و نەهێشتنی ناردنی تەقەمەنی و هێزی شەڕکەریان هەبێ.

پاش ئەم رێکەوتنە سەرهەنگ محەممەدی نانەوازادە فەرماندەی هێزی ناوەندیی مەهاباد لە لایەن وەزارەتی بەرگری کوردستانەوە بۆ چاوەدێری کردنی ئەو خواردەمەنی و کەلوپەلە غەیرە نیزامیانەی دەوڵەت دەینارد بۆ هێزەکانی ناردرایە سەقز و وەک پشکێنەری تایبەتی وەزارەتی بەرگری کوردستان دانرا و خەریکی کاروباری سەراسۆیی و چاودێریی بانە و سەقز بوو.

لای ڕاست سەرهەنگ محەممەد نانەوازادە، لای چەپ، محەممەد

حوسێن فەتاحی قازی

بەداخەوە لەڕێی بەڕێوەبردنی ئەم مەئمورییەتەدا ڕۆژی ١٣٢٥/٤/٢٥ی.ە کە بە فرۆکەیەکی نیزامی لەبانەوە دەچووە سەقز؛ بەهۆی بەربوونەوەی فرۆکەکە لە کەلیخان گیانی لە دەستدا و تێکەڵ بە کاروانی شەهیدانی نەتەوەی کورد بوو.

تەرمی شەهید نانەوازادەیان هێناوە مەهاباد و لە ڕێوڕەسمێکی نیزامیدا لە گۆڕستانی مەلاجامی بەخاک سپێردرا.

## رێککەوتننامەی دۆستایەتیی کوردستان و ئازەربایجان.

بەر لەوەی موزەفەری فیزوز بۆ وتووێژی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و ئازەربایجان بچێتە تەورێز؛ پەیمانێکی دۆستایەتی لە نێوان کوردستان و ئازەربایجان بۆ پتەوترکردنی پەیوەندی هاوکاری نێوانیان (رێکەوتی ١٣٢٥/٢/٣ - ١٩٤٦) لە تەورێز لە نێوان بەرێوەبەرانی دوو حکوومەتی کوردستان و ئازەربایجاندا بەسترا. هەیئەتی نوێنەرایەتیی کوردستان بە سەرۆکایەتیی قازی محەممەد پێکهاتبوو لە: حاجی سەید عەولای گیلانیزادە، حەمەحوسێن خانی سەیفی قازی "وەزیری شەڕ" عومەرخانی شەریفی سەرۆکی عەشیرەتی شکاک، رەشیدبەگی جیهانگیری سەرۆکی عەشیرەتی هەرکی، زێڕۆبەگی بە هادوڕیی هەرکی و قازی محەممەدی خزری نوێنەری شنۆ:

هەیئەتی نوێنەرایەتیی ئازەربایجانیش پێک هاتبوو لە میر جەعفەری پیشەوەری، سەرۆکی حکوومەتی ئازەربایجان و میرزا عەلی شەبستەری، سەرۆکی ئەنجوومەنی میللی ئازەربایجان سادق پادگان، جێگیری کۆمیتەی ناوەندی و محەممەد بیرِیا. پاش ئیمزاکردنی پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاریی نێوان کوردستان و ئازەربایجان، (شاندێکی) نوێنەرایەتی کورد و ئازەری لە رێکەوتی ١٣٢٥/٢/٨ی.ە دا بەسەرۆکایەتیی پێشەوەری بۆ دانوستان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی بەرەو تاران وەڕێ کەوتن.

## وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی لە تاران.

حکوومەتی ناوەندی هەر خەریکی فێڵ و تەڵەکە و کات بەفیڕۆدان و وەدواخستنی دانیشتنەکان و هاتووچۆی بێ ئاکام بوو. نوێنەرانی کوردستان و ئازەربایجانیش لە هەوڵی کەڵکوەرگرتن لە وتووێژەکان بوون لە پێناو دابین کردنی خودموختاری و وەدەستهێنانی دەستەڵاتی پێویست بۆ بە هێزترکردنی حکوومەتەکانی.

بەڵام، پاش دوو کەڕت سەفەری شاندەکانی نوێنەرایەتیی (کورد و ئازەری) بۆ تاران و هاتنی شانێکی حکوومەتی ناوەندی بەمەبەستی درێژەپێدان بە وتووێژەکان و لە راستیدا بۆکات بەفیڕۆدان بۆ شاری تەورێز؛ چونکە وتووێژەکان بێ ئاکام مانەوە؛ قەوام سەڵتەنە، سەرۆک وەزیرانی ئێران، بەمەستی وتووێژ و راگۆڕینەوە قازی محەممەدی بانگ کردە تاران. هەڵبەت پێویستە ئاماژە بە دوو شت بکەم: یەکەم ئەوەی کە؛ بەرپرسانی حکوومەتی ئازەربایجان وێڕای بەستنی پەیمانی دۆستایەتی دەگەڵ کوردستان بە پێچەوانەی پەیمانەکە دەجووڵانەوە و دانیان بەماف و دەستەڵاتی بەرامبەر و یەکسانی کورد دانەدێنا. خاڵی دووهەم ئەوەیەکە: حکوومەتی ئێران لە لایەکەوە خەریکی وتووێژ و دانوستان لەگەڵ نوێنەرانی کوردستان و ئازەربایجان بوو؛ بەکات بە فیڕۆدان و وتووێژی دوورودرێژ؛ شاندەکانی نوێنەرایەتی دەخافڵاند و لەلایەکی دیکەوە خەریکی بەهێزکردنی سەربازخانەکانی سەقز و سنە و سەردەشت بوو و لەو دەرفەتەی کە بۆ وتووێژ رەخسابوو بۆ تەیارکردن و بەهێزکردنی ئەو سەربازخانانە کەڵکی وەردەگرت کە لە گەمارۆی هێزی پێشمەرگەدابوون.

پێداگری کرابوو لەسەرئەوەی کە لە وتوویژ و راگۆڕینەوەکاندا؛ چ لەو سەفەرەکانی شانە نوێنەرایەتی کوردستان و ئازەربایجان بە سەرۆکایەتیی پێشەوەری و چ لە سەفەرەکانی شاندی نوێنەرایەتی حکوومەتی مەرکەزی‌دا بەسەرۆکایەتی موزەفەری فیرۆز بۆ تەورێز مەسەلەی کوردستان بخەنە پەراوێز و بیکەنە شتێکی لاوەکی. حکوومەتی تاران و تەنانەت حکوومەتی ئازەربایجانیش کە هاوپەیمانی کوردستان بوو نەیاندەویست مەسەلەی کوردستان وەک کێشەیەکی سەربەخۆ بخرێتە بەرباس بەڵکو هەر دوولا دەیانویست کوردستان بەشێک بێ لە ئازەربایجان و جیاواز نەبێ.

لەوەها دۆخ و هەلومەرجێک دابوو کە قازی محەممەد بۆ وتوویژ و گۆڕینەوەی بیروڕا لەلایەن قەوامەوە بانگهێشت کرایە تاران، شتێکی دیکە: قازی محەممەد جارێکی دیکەش لە رەزبەری ١٣٢٣ی.ە دا لەگەڵ قەرەنی ئاغای مامەش و عەولا ئاغای مەنگوڕ و بایزی عزیز ئاغای گەورک و عەلی ئاغای میر ئەسعەدی دێبوکری؛ کە هەر چواریان لە سەرۆک عەشیرەتەکانی دیبۆکری بوون. بۆ وتوویژ لەسەر باردۆخی ناوچە چووە تاران و ئەبولقاسمی سەدری قازی نوێنەری مەهاباد لە پەرلەمان شورای میللی و حوسێن خانی سەیفی قازیش لەو وتوویژانەدا بەشدار بوون.

قازی محەممەد لە سەفەری پێشووی‌دا بۆ تاران چاوپێکەوتنێکیشی لەگەڵ سەر لەشکەر ئەرفەع سەرۆکی ستادی ئەرتەش کرد بوو. ئەرفەع لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: قازی محەممەد و برادەران، سەدری قازی و سەیفی قازی هاتنە ستادی سوپا و سەبارەت بە مەسەلە و کێشەکانی کوردستاندا قسەکرا. سەیفی قازی و سەدری

قازی لە لێدوانەکاندا بڕێک نەرمییان دەنواند و هیوادارییان دەردەبڕی کە حکوومەتی ئێران باشتر ئاوڕ لە مافەکانی کوردستان بداتەوە و تایبەتمەندییەکانی نەتەوەی کورد دەرک بکا بۆ ئەوەی کوردەکانیش بتوانن لە ئاوەدان کردنەوە و پێشکەوتنی ئێراندا هاوکاری و ڕۆڵی بەرچاویان هەبێ. بەڵام قازی محەممەد راشکاوانە تر (رادیکاڵتر) قسەی دەکرد و باسێکی تێر و تەسەلی لەسەر ئەو ستەم و زوڵمانە کرد کە لە کوردەکان کراوە. (ئەرفەع لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: منیش بۆ پشتگیریی و تەئیدی بەشێک لە قسەکانی قازی محەممەد دا ویستم هیواداریان کەم بە دڵۆڤانی و بەزەیییەکانی خاوەن شکۆ (اعلی حضرت). بەڵام لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت قازی بییەک نییەبەو بایانە بلەرزێ.

## "دیسان سەفەر بۆ تاران"

پاش چەند تێکهەڵچوونی چەکدارانە لە نێوان سوپا و پێشمەرگەکانی کوردستان لە شەڕگە سەقز و وتووێژ ڕێککەوتنی نێوان قازی محەممەد و سەر لەشکەر رەزم؛ حالەتێکی نەشەڕ نە ئاشتی، لە ناوچەکەدا پێکهاتبووە قازی محەممەد و کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستانیش لەژێر گوشاری دەوڵەتی سۆڤیەت دابوون کە لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی حکوومەتی ناوەندی دا پێشڕەوی نەکەن و تا بۆیان دەکرێ؟ لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی پێک بێن کە ئەوەش لەو گوشارانەوە سەرچاوەی دەگرت کە دەوڵەتانی بەریتانیا و ئەمریکا دەیانخستە سەر سۆڤیەت. دەوڵەتی ئێرانیش چاوەڕێی ئەوە بوو دەگەڵ باشتر بوونی بارودۆخەکە؛ مەسەلەی چۆڵ

نەکردنی ئێران لەلایەن سۆڤیەتەوە؛ بگەیەنێتە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و لەوەها هەلومەرجێکدا بوو کە بۆ دووبەرەکی سازکردن لە نێوان کوردستان و ئازەربایجاندا قازی محەممەد بانگ کرایە تاران و ئەویش لە مەهابادەوە بەرەو تەورێز وەڕێ کەوت و لە تەورێز لەگەڵ بەرپرسی حکوومەتی ئازەربایجان و سۆڤیەت وتووێژی کرد و رۆژی ١٩٤٦/٤/١٨ی.ز بە فڕۆکەیەکی رووسی کەسی کەسێکی هەڵگرتبوو، بەرەو تاران وەڕێ کەوت. نووسەری ئەم دێڕانەشی لەگەڵ بوو. پاش دووسەعات، فرۆکەی رووسی لە فرۆکەخانەی تاران نیشتەوە و لە لایەن نوێنەری قەوام سەڵتەنە و کوردەکانی دانیشتووی تاران و ژمارەیەکی زۆر رووناکبیر و (سیاسەتمەداری) ئێرانی و هۆگرانی چارەسەریی گیروگرفتەکانی وڵاتەوە، بە گەرمی پێشوازییان لێ کرا و لەگەڵ کاروانی ئوتومبێلی

قازی محەممەد لە هوتێلی دەربەندی تاران

لای راست سەعید هومایون، لای چەپ مستەفا سوڵتانیان ١٣٢٥/ ١٩٤٦

پێشوازیکەر بەرەو هوتێلی دەربەندی شەمیران وەڕێ کەوتن. لە هۆڵی هوتێل دەربەند ڕێورەسمی ناساندن و بەخێرهێنانی دووبارە لەلایەن نوێنەری قەوام سەڵتەنە و ژمارەیەک ڕۆژنامەنووس بەڕێوە چوو. پاش دوو سەعات وتووێژی تایبەتی و ئاسایی دەگەڵ خەڵک و ڕۆژنامە نووسان، قازی محەممەد بەرەو (کۆشکی) "بینا" ژمارە ٥ی هوتێل دەربەند کە بۆ پشوودان و مانەوەی وی دیاری کرابوو کەوتە ڕێ.

قازی محەممەد لەو سەفەرەدا چاوی بە ژەنەڕاڵ ئیحسان نووری پاشا کەوت. ئیحسان نووری پاشا، ڕێبەری شۆڕشی ئاگری کە بەهۆی هاوکاریی ئێران لەگەڵ تورکیا؛ تێک شکابوو و هاتبوو ئێران، لە ئێران دەژیا و نەیدەتوانی لە تاران وەدەرکەوێ. قازی محەممد لەگەڵ دکتور هاشمی شیرازی کە دۆستی نزیکی ئیحسان نووری پاشابوو، چوونە ماڵەکەی و ماوەی چەند سەعاتێک لە ماڵی ئیحسان نووری، کێشە و مەسەلەی کوردستانیان تاووتوێ کرد. ئالآی کوردستان لە دیوی میوانانی ئیحسان نووری پاشا بە دیوارەوە (هەرواسرابوو). هەروەها هێما (ئارم)ی حیزبی خۆیبوونیش لەسەر مێزی کارەکەی بوو.

من (نووسەر) لەو کاتەدا جلوبەرگی نیزامی (یونیفۆرم) ی کوردستانم لەبەردابوو کە بۆ ئەوانەی هاتبوونە پێشوازیمان، شتێکی تازەبوو. هەربۆیەش دەیانپرسی ئەوە چ جۆرە شمەکێکە. سەدری قازی گوتی؛ هەربەو شمەکانەوە هاتووی یا کۆت و شەلواریشت هێناوە؟

لەبەر ئەوەی پێشەوا بۆ ئاشتی و دانوستان تەشریفیان هێناوە وا باشترە ئێوەش کۆت و شەلوار لەبەرکەن. بەقسەم کرد و هەرگەیشتینە کۆشکی ژەی دەربەند، جل و بەرگی ئاساییم لەبەرکرد.

لەو ماوەی ئەو حەوتووەدا، قازی محەممەد لە تاران، دووجار لە کۆشکی هاوینی وەزارەتی دەرەوە، دووجار لەگەڵ قەوا سەڵتەنەی سەرۆک وەزیران و چەند جارێکیش لەگەڵ موزفەری فیروز، جێگیری سەرۆک وەزیران و سەر لەشکر رەزم ئارا، سەرۆکی ستادی ئەرتەش چاوپێکەوتن و وتووێژیان کرد.

لە نێو قسەکانیاندا، ئەوەندەی من تێگەیشتم، پێشنیاری قەوامو سەڵتەنە ئەوە بوو کە ناوچە کورد نیشنەکانی رۆژئاوای ئێران، پارێزگاکانی ئازەربایجانی غەربی و کوردستان و کرمانشان بەیەک ناو، واتە ئۆستانی کوردستان، بناسرێن، پارێزگارەکەشی قازی محەممەد بێ. قازی محەممەد، بە گران و سەنگینی و لە سەرەخۆییەوە لەگەڵ منێردراوانی دەوڵەت و وتووێژکەران هەڵسوکەوتی دەکرد، تەنانەت لە وتووێژ دەگەڵ رۆژنامەنووس و هەواڵنێری بڵاڤۆکان دا کە سەبارەت بەکاروباری دەوڵەت لێیان دەپرسی سەبارەت بە ئاغای قەواموسەڵتەنە گەشبینی دەنواند. بەڵام من وای بۆ دەچووم کە قازی محەممەد پێشنیارەکانی حکوومەتی بە دڵسۆزی نەدەزانی. هەربۆیەش، وڵامی راشکاوانەی پرسیارەکانی دەهێشتەوە بۆ کوردستان و راوێژکردن دەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و حکوومەتی کوردستان. لە گەڕانەوەیدا بۆ تەورێز و ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەگەڵ کاربەدەستانی ئازەربایجان و لە لێدوانە تایبەتییەکانییدا لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەت و نێردراوانی پایەبەرزی

ئەوان لە تەورێز، وا دەردەکەوت کە هەردوولایەن لە قبووڵ کردنی ئەم پێشنیارە ناڕازین و بەگشتی وادیار بوو حکوومەتی ناوەندی و خودی قەوام و موزەفەری فیروز لە فکری ئەوەدا بووون کە ناکۆکی و دووبەرەکی بخەنە نێوان حکوومەتی کوردستان و ئازەربایجانەوە سۆڤیەتییەکانیش گەرچی لە پێشدا نەیاندەویست شەڕ و ناکۆکی لە نێوان ئەو دوو حکوومەتە ناوچەییە و دەوڵەتی ناوەند (هەڵبگیرسێ)، بەڵکو دەیانویست هەتا. دانیشتنەکانیان لەگەڵ قەوام لەسەر وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی باکوور، بە ئاکام دەگا، ئەوان دەبێ پاڵهێزێکی گوشاریان (ڕهوم فشار) لەدەستدابێ. لە لایەکی ترەوە ئازەربایجانییەکان نەیاندەویست کوردستان بە تەنێ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران پێک بێ و کوردستان ببێتە هەڵکەوتەیەکی دیار و سەربەخۆی جوغرافیایی لە ئێراندا، بەڵکو ڕازی بێ بە (دابین کردنی) بەشێکی کەم لە مافەکانی.

سەفەرەکەی قازی محەممەدیش بۆ تاران بێ دەسکەوت قازی لەو سەفەرەدا کۆت و شەلوارێکی شینکی و سادەی پۆشیبوو. ئاکار و هەڵسوکەوتیشی وەک هەمیشە ماقووڵانە و گران و سەنگین بوو. هەر بەو جۆرەش بەڕووخۆشی بەپیر ئەو کەسانەوە دەچوو کە دەهاتنەلای. بەڕاستی لە دڵی ئەوانەدا کە دەچوونەلای جێی خۆی کردبۆوە. لە وتووێژەکانیشیدا کە لەگەڵ هەواڵنێرانی ڕۆژنامەکانی تاران بۆ وێنە ڕۆژنامەی "رهبر و ایران ما" هەیبوو بە ڕستەی کورت و ڕوون و بە ئیمان بە ئازادی و دیموکراسی بۆ ئێران و تیشک خستنە سەر پێشینەی مێژوویی و خەباتی نەتەوەی کورد، بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و دیاریکردنی مافی چارەنووس و هیواداری

بە پێکهاتن و رێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتی ئێران، بە جوانی دەری خست کە بەسەر مەسەلە سیاسی و پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا، زاڵە ولێیان شارەزایە.

شەرحی چاوپێکەوتنەکانی قازی محەممد لە تاران، لەگەڵ باڵوێزی بەریتانیا، ئارچی باڵد روز ڤڵیت و ئیحسان نووری پاشا، لە کتێبی بیرەوەرییە سیاسیەکانی دوکتور هاشم شیرازیدا هاتووە.

قازی محەممەد پاش هەفتەیەک مانەوە لە تاران؛ هەر بە فرۆکە رووسییەکە کە لە هێڵی ئاسمانی تەورێز تاراندا ئیشی دەکرد، گەڕایەوە بۆ تەورێز، دوو رۆژیش لە تەورێز مایەوە. لەسەر پێشنیارەکانی قەوام قسەی لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتی ئازەربایجان کرد و رۆژی ١٩٤٦/٤/٢٧/٢٥ی.ز لەلایەن ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکرات و بەرپرسانی حکوومەتی میللییەوە کە هاتبوونە میاندواو پێشوازیی لێکرا و هەروەها لە مەهابادیش خەڵک و ژمارەیەکی زۆر لە (عەشایرو) خەڵکی دێهاتەکان بە شادمانی و بە چەپکە گوڵەوە چوونە پێشوازیی.

## ئاخافتن لە مەهاباد

پاش هەفتەیەک، قازی محەممەد لە ئاخافتنێکدا سوپاسی خەڵک و پێشوازی کەرانی کرد و رێزی گرت لە قوتابییان و یەکیەتی لاوان. قازی لەو کۆبوونەوە مەزنەدا کە لە رۆژی ١٣٢٥/٥/٤ی.ە-١٩٤٦ی.ز دا پێکهات سەبارەت بە سەفەرەکەی تارانی گوتی: ئێوە باش دەزانن، من شەو و رۆژ بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی نەتەوەی کورد لە حەول دام، ئەم حەوڵ و تەقەلایەش بە شانازی دەزانم و

هەتا دوایین چرکەی ژیانم دەست لە تێکۆشان و فیداکاری هەڵناگرم و دەیسەلمێنم کە نەتەوەی کورد، شیاوی ئەوەیە خاوەنی ئازادی و دیموکراسی بێ خۆ دەزانن ئێمە هیچ کات خوازیاری لەتکردنی ئێرانی نەبووین. بەڵام هەتا ئێستاش دەستەڵاتاران نە تەنیا جەوابێکیان نەداوینەتەوە بەڵکوو گاڵتەشیان پێ کردووین. ئێمە ناچار بووین حکوومەتی میللی دامەزرێنین. خۆشمان بە تاقی کردەوە و لە بەرامبەر ئەوانەدا کە دەیانویست پێشمان بگرن راوەستاین و بەرگریمان لە خۆمان کرد. ئێستا ئەوان پاشە کشەیان کردووە. ئێمەش لەوە زیاتر ناچینە پێشێ. لە سەفەری تارانمدا زۆرم قسە لەگەڵ قەوامو سەڵتەنە کرد. ئەو رای بەنیسبەت کوردەوە باشە و لەو لێدوانانەدا گوتی: ئێمەش بووینەتە دیموکرات و ئێستا حیزبی دێموکراتی ئێرانمان دامەزراند، وام پێ باشە ئێوەش ناوی حیزبە دێموکراتی کوردستان بگۆڕن و؟ پێی بڵێن حیزبی دێموکراتی ئێران. لە وەڵامدا پێم گوت: تاکوو کۆمیتەی ناوەندی پەسندی نەکا من ناتوانم هیچ شتێ بڵێم چونکە مانای دیموکراسی ئەوەیە کە هیچکەس بێ راپرسی (راوێژ) لەگەڵ خەڵک بۆی نییە چارەنووسی نەتەوەکەی دیاری بکا. قەواموسەڵتەنە دانی بەوەدا هێنا کە کوردەکان شایانی رێزن و نەتەوەی کورد بۆ دەستەبەر کردنی دیموکراتی ئامادەی هەر چەشنە فیداکارییەکە و گوتیشی: بزووتنەوەی دیموکراتی کوردستان بە پاڵپشتێکی ئارمانجەکانمان دەزانین و هیوادارین هەموو ئێران چاو لە ئێوە بکەن و دیموکراسی تێدا جێگیر بێ.

پێشەوا قازی محەمەد ١٣٢٥

# چەند خاڵێکــی گــرینگ

١- قازی محەممد بۆیە باوەڕی بە پێشنیارەکانی قەواموسەڵتەنە نەکرد؛ چونکە بەپێی ئەزموونەکانی پێشوو، پەیمان شکێنی و پاشگەزبوونەوەی حکوومەتەکانی ئێران لەو بەڵێنانەی بە کوردەکانیان دەدان؛ کە هەرکاتێک دەوڵەتان لاواز دەبن، قەول و بەڵێنە دەدەن و ملکەچ دەبن هەر کە بەهێزبوونەوە و هەلیان بۆ رەخسا هەموو قەول و قەرار و بەڵێنەکان (پێچەوانە دەبنەوە).

٢- قازی محەممەد زۆر لەسەر وادە و بەڵێنی خۆی و حکوومەتی کوردستان سوور بوو. نەشیدەویست ئازەربایجانییەکان

بە پەیمان شکێنی لە قەڵەم بدەن چونکە بە قبووڵ کردنی پێشنیارەکەی قەوام؛ کوردستان و ئازەربایجان لێکجیا دەبوونەوە. ئەگەرچی ئەوان زۆر (پابەند) وادە و بەڵێنەکانی خۆیان نەبوون. لە لێدوانەکانیاندا لەگەڵ تاران قایل نەدەبوون کوردستان و ئازەربایجان مافی وەک یەکیان هەبێ.

٣- قازی محەممەد هەستی بەوە دەکرد کە سۆڤیەتییەکانیش وێڕای رەزامەندی و پێ خۆش بوونیان بە پێکهاتن لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی؛ دڕدۆنگ بوون لە (قبووڵ کردنی) ئەم پێشنیارەدا و دەیانویست لەگەمەی سیاسەتی گەل قەواموسەڵتەنە کوردستانیان وەک کارتێک بەدەستەوەبێ.

قەواموسەڵتەنە زیرەکانە دەیویست بەوپێشنیارە ناکۆکی بخاتە نێوان ئەو دوو حکوومەتە میللییەوە و بە پێشنیاری رێک کەوتن؛ تاڕادەیەک سەرنجی سۆڤیەتییەکان بۆلای دەوڵەتەکەی خۆی راکێشێ و لە لایەکی دیکەوە؛ بە وتووێژ لەگەڵ سۆڤیەتییەکان و دانی ئیمتیازی نەوتی باکوور پێییان، لە پشتیوانی کردنی حکوومەتی کوردستان و ئازەربایجان پاشگەزیان بکاتەوە. هەر بۆیەش ئەوکاتەی حکوومەتی کوردستان بە هێزی سوار چاکی عەشیرەت و پێشمەرگەی چالاکەوە ئامادەبوو بەرەو سنە و ناوچە کوردنشینەکانی تر وەڕێ کەوێ و هێرش بەرێ؛ سۆڤیەتییەکان بە ئاشکرایی و راشکاوانە؛ بە کوردستانیان راگەیاند لە هێرش کردنە سەر سەربازخانەکانی ئێران و پێشڕەوی بەرەو سنە و کرماشان خۆ ببوێرن و بیانووشیان ئەوە بوو کە دەیانگوت پێشڕەوی هێرشی پێشمەرگە بەرەو سنە و کرمانشان دەبێتە هۆی دژ

کردەوەی بەریتانیا، بەمەبەستی پاراستنی سەرچاوەی نەوتییەکانی کرمانشان و تەنانەت لەوانەیە راستەوخۆ بێتە نێوشەرەوە و ئەگەر وای لێ بێ کوردەکان نابێ چاویان لە یارمەتی و پشتیوانی سۆڤیەتیەکان بێ و دەولەتی سۆڤیەتیش ئەودەم نایهەوێ رێگەی پێشرەویی هێرشی سوپای ئێران بۆ کوردستان بگرێ کە لە رێگەکانی ترەوە دێن. بەو فێڵ و تەڵەکەبازیە حکوومەتی کوردستانیان لەگرتنی شارەکانی دیکەو پێشڕەویی بەرەو سنە گیراوە و ئەو جارەش کە هەڵێکی لەبار بۆ ئاشتی و رێککەوتن پێکهاتبوو، ئەوان قایل نەدەبوون هەر بۆیەش هەم دەرفەتی پێشڕەوی و ئازادکردنی ناوچە کوردنیشینەکان و هەم دەرفەتی ئاشتی و رێککەوتن لە دەست چوون و بارودۆخ و هەلومەرجی رۆژگاریش حکوومەتی کوردستانی ناچار کرد مل کەچی پێشنیاری رووسەکان بێ.

## سەردانی باکووری کوردستان

پێشەوا قازی محەممەد دوای گەڕانەوەی لە تاران کەوتە فیکری بەسەرکردنەوەی باکووری کوردستان، بۆ وێنە شارەکانی ورمێ، سەلماس، خۆی، ماکۆ. لە نیوەی گەلاوێژی ١٣٢٥ی.ه دا بەرێزیان لە مەهابادەوە بەرەو ئەو ناوچانە کەوتەرێ. ئەندامانی کومیتەی ناوەندیی حیزب و هەیئەت رئیسەی میللی و ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆکی عەشیرەتەکان و چینە جیاوازەکانی شار و دێهاتی مەهاباد لەو شەقامەدا کە دەچێتەوە سەر "چوارچرا" کۆبوونەوە و چاوەڕێی هاتنی پێشەوا و بەرێکردنی بوون. زۆری نەکێشا کە قازی

محەممەد لە نێو هەیئەت رەئیسەی میللی و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندەیی حیزب، نوێنەرانی عەشایر و چین و توێژەکانی خەڵکی شار و دێ. دەرکەوت و لەپلیکانەی بینای حیزبەوە هاتە نێو خەڵک. دەنگی بژی رێبەری خۆشەویست و چەپڵە رێزان بەرزبۆوە. پێشەوا بە ئاماژەی دەست و سەر وەڵامی دانەوە بەرێزەوە و بەوتە جوانەکانی، سوپاسی ئامادەبوان و نوێنەرانی دەوڵەت، حیزب، خەڵک و عەشیرەتەکانی کرد و بەو عەشق و ئەوینەوە کە خەڵک بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی و مافە نەتەوەییە رەواکانیان هەیانبوو سوپاسی کردن. ئەوجار؛ عەشیرەتەکانی مەنگوڕ، مامەش و دێبوکری و نوێنەرانی چینەکان، یەک بەیەک چوونە لای و وەفاداریی خۆیان دەربڕی و پەیمانیان لەگەڵ نوێ کردەوە. قازی محەممەد لە نێو شەپۆلی ئامادەبوان و کەفوکوڵی خەڵکەکەدا، سواری ماشێن بوو. حاجی بابەشێخ سەیادەت سەرۆکی هەیئەت رەئیسەی میللی لە ماشێنەکەی وی دا سوار بوو، نووسەری ئەم دێرانەش کە شانازیی ئەوەم پێ بڕابوو لەگەڵیان بم لە پێشەوەی ماشێنەکە و لەتەنیشت شوفیرەکەوە دانیشتم و ماشێنێکی جیپ "Jeep" کە چەند کەس لە هاوڕێیانی تێدابوو، لەگەڵ دوو لۆری پڕ لە پێشمەرگەی کوردستان کە "ئیسکۆرتمان" (حیمایە) بوون لە مەهابادەوە بەرەو ورمێ وەڕێ کەوتین.

ژمارەیەکی زۆر لە وانەی بۆ بەڕێ کردن هاتبوون هەتا پێنج کیلۆمەتریی شاری مەهاباد، هاتبوونەوە. قازی محەممەد، دوو رۆژ لە ورمێ مایەوە و نوێنەران و پیاو ماقووڵانانی شار سەردانیان کرد. و لەسەر بانگهێشتی حاجی ئەمیری نەزمیی ئەفشار، پێشەوا

قازی و هاوڕێیانی، بۆ شێو خواردن چوونە باغەکەی ئەو لە دەرەوەی شار پاش دوو ڕۆژ مانەوە لە ورمێ و چاوپێکەوتن

قازی محەممەد لە ڕۆژانی لاوێتیدا

لەگەڵ نوێنەرانی عەشیرەتەکانی دەوروبەر، ئەو ڕێنوینی یانەی، بۆ هاوکاریی زیاتری نێردراوانی کوردستان و ئازەربایجان بۆ دابین کردنی ئاسایشی و هێمنی پێویست بوون پێی ڕاگەیاندن عومەرخانی شەریفی سەرۆکی هۆزی شکاک کە بۆ پێش‌وازی لە قازی محەممەد هاتبووە ورمێ لەگەڵ ئەوان و هۆزە ناوچەییەکانی دیکە بەرەو سەلماس وەڕێ کەوت.

قازی محەممەد بەر لەگەیشتن بە سەڵماس لەسەر داوای عومەرخان بۆ، شوێنی مانەوەی ئەو لە گوندی زیندەشت دۆیی بوو. ئەو دەمەش کاتی درۆینەی گەنم بوو. بە قەراغ گەنمە جاڕاندا دەڕۆیشتن. هەر وەرزێر و پاڵە بوو باقەگەنمیان لەسەرسەروین هەنگڵ بەرەو قەراغ رێ دەهاتن و بەجێ چەیکەگوڵ باقەگەنمیان دەهێنا بۆ پێشوازیی پێشەوای خۆیان و داوای دوعای خێر و بەرەکەتیان لێدەکردو بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە بە خێرهاتنیان دەکرد لە زۆر جێیان قازی محەممەد لە ماشێنەکەی دادەبەزی و ورزێرانی لەباوەش دەگرت و دەست خۆشی لێدەکردن. چەکدارانی عەشیرەتەکانی شکاک بە تەقەی بەردەوام خۆشحاڵیی خۆیان دەردەبڕی و خەڵکی دوورو نزیکیان لە هاتنی پێشەوا ئاگادار دەکردنەوە بەرێزیان بەرلەوەی بگەنە ئاوایی (زین دەشت) لەئاوایی "دەرمان ئاوا" لای دا بۆ زیارەتی گۆڕی چەند ئەسحابەیەکی پێغەمبەر کە بۆ تەبلیغ و پەرەپێدانی ئایینی ئیسلام هاتبوونە ئەو ناوچەیە و بەڕێز و بە دڵپاکییەوە چووە سەرقەبریان و پاش خوێندنی "فاتیحە" و نزا؛ چوون بۆ سەرچاوەی ئاوی گەرمی ئاوایی. لەسەر تەپۆڵکەی بەر ئاوایی کانییەکی گەرمی لێبوو کە ئەستێرەیکی خنجیلانەیان بۆ خۆ شوشتن لە پێشی دروست کردبوو. دەیانگوت ئەو ئاوە بۆ دەرمانی نەخۆشییەکانی پێست یەکاویەکە. کە بەسەر تەپۆڵکەکەدا دەرۆیشتی پێت لەهەر شوێنێک دانابایە لەجێ پێت هەڵم هەڵدەستاو پیاو وای هەست دەکرد دڵی کێوەکەش وەک دڵی نەتەوەی کورد لە کۆڵەوە دەیهەوێ لە دەرفەتێکی گونجاو لە گڤارە ببەستێ.

قازی محەممەد دوای زیارەتی گۆڕی ئەسحابەکانی پێغەمبەر و دیتنی کانییە گەرمەکە بەرەو زین دەشتی ملکی عومەرخانی شەریفی سەرۆکی عەشیرەتی شکاک کەوتەڕێ مەودای چەند کیلۆمەترێک مابوو بگەنە ئاوایی، کەکوڕەکانی عومەرخان و چەند سوارێکی چەکدار و چەند کەسێکیش پیادە؛ لەم بەرەوبەری رێگا کە بەرێز وەستابوون دەگەڵ گەشتنی ماشێنی مێوانەکان؛ بۆ بەخێرهاتنیان چەند تەقەیەکیان کرد. ئەو شەوە میوانی عومەرخان بووین. قازی و حاجی بابەشێخ و چەند میوانێکی دیکە لە دیوێکی تایبەت پشوویان دا. پێشمەرگەکانیش لە دوو خێوەتدا کە لە خوارووی ماڵەکانەوە هەڵیاندابوون، حەوانەوە ئاوایی زیندەشت یەکجار خۆش و دلگربوو بەونێوەڕاستی هاوینە شەوێکی زۆر فێنکی هەبوو. وەرزێرانی ئاوایی و بەگزادەکانی شکاک  کە بە تاسەوە هاتبوون بۆ دیتنی رێبەری خەڵکی کوردستان لە هۆڵی میواناندا کۆببوونەوە. ئەوەندەی خەڵک تێڕاژبوو کە دەرزیت هەڵاویشتبا وەعەرزی نەدەکەوت. نەتدەزانی چۆنیان پێ بڵێی پاش چاوپێکەوتن بچنە ژوورێکی دیکە. من شتێکم بە مێشک داهات و بە کاپتان محەممەدی خانی کە یەکێک لە ئەفسەرەکان بوو، گوتم؛ بێجگە لە کوڕەکانی عومەرخان هەرچی هات بێ ئەوەی دلی بێشێ وەپێشیکەون  بۆ وەتاغەکەی دیکە یا بۆ یەکێک لەخێوەتەکان.

پاش سەعاتێک ئاپۆرەی خەڵک وردەوەردە کەم بۆوە و جێگای دانیشتنمان بوو. بۆ سبەینێ لەنێو کەفو کولی بە هەستی خەڵکدا بەرەو سەلماس کەوتینەڕێ. عومەرخانی شەریفی و چەندکەسی دیکەی سەرۆک عەشیرەت و پیاو ماقوولانی شکاکیشمان رەگەڵ

کەوتن و بەکاروانێک ماشێنەوە گەیشتینە سەلماس و لەلایەن خەڵک و عەشیرەتەکانەوە پێشوازیمان لێکرا. بێجگە لە کوردەکان؛ ئازەرییەکانیش کە زۆر دڵخۆش و هیوادداربوون بەئاکامی ئەوسەفەرەو نیاز پاکیی رێبەری کوردستان بۆ یەکیەتیی زیاتر نێوان کوردو ئازەرییەکانی ئەوێ، وێڕای ئەوان بەگەرمی هاتنە پێشوازیی. بەڕێزیان وێڕایی خۆناساندن و ئاشنایەتیی دەگەڵ خەڵکەکە، لەسەر پێکهێنان و بەردەوامیی ئاشتی و هێمنی لەناوچەکەدا؛ پێیداگرت و هیواداری کردن بە ئایندەیەکی روونترو گەشتر. لە پاشان قازی محەممەد و هاوڕێکانی لە شاری سەلماسەوە بەرەو شاری خۆی وەرێکەوتن،. لەڕێگەداو لەشاری خۆیشدا هەروا دەگەڵ پێشوازیی گەرمی خەڵک بەرەو روو بووینەوە. نوێنەرانی چینە جیاوازەکان و مەئموورانی ئازەربایجانیی بەسەرکردەوە و رێزی لێگرتن. ئەو سەنەرە لەڕاستیدا سەفەری نیاز پاکی وبێ خەوشی و پێکهێنانی فەزای و یکهەڵکردن زیاتر نێوان کوردو ئازەری بوو و ئەوانیشی بە داهاتوویەکی پڕشنگدار هیوادارکرد. پاش شەو و رۆژێک هەیئەتەکە "لەخۆی" یەوە بەرەو ماکو، دوایین شوێنی مەبەست کەوتەڕێ.

لەکاتی وەدەرکەوتن لەخۆی؛ هەر دەگەڵ وەدیارکەوتنی کێوی پۆشی ئاگری؛ قازی محەممەد بەیادی شۆڕشی بوێرانەو لە خۆبوردوویی کۆڵنەدەرانی کوردی تورکیا سڵاوی لە کێوی ئاگری کردوگوتی؛ سڵاوت لێ بێ ئەی ئاگری؛ تۆ دواجار بە بڵێسەی ئاوری شۆڕشێگرانەت ئاور لە خەرمانی داگیرکەرانت بەردەدەی.

بەڕاستی قسەکانی وایان لە مێشکی گەنج کرد کە فرمێسکەکانم لووزەویان بەست و ئەوجار بە دیدێکی ئاوەڵاترەوە، سەری کڕنۆشم

لەبەر مەزنی کێوی ئاگری و شۆڕشگێڕەکانی دانواند. بە درێژایی ڕێگەی خۆی هەتا ماکۆلە "سیاچەم"

عەشیرەتەکانی خنکانلو، میلان و جەلالی و هەرمەنی هاتنە پێشوازیی قازی محەممەد و بەگەرمی و ڕێزەوە بەخێرهاتنیان کرد و هەتا ماکۆ گەلێک خەڵکی دیکەمان رەگەڵ کەوتن لەشاری ماکۆش هەربە هەمان شێوە وەرگێڕاین و خەڵک بە هۆگرییەوە هاتبوونە پێشوازیمان و شانازیان بە پێشەوا قازی محەممەدەوە دەکرد.

شاری ماکۆ کەوتۆتە نێوان دوو زنجیرە کێوی بەرزو درووودرێژ و چۆمی زەنگمار لە داوێنی کێوەکەوە و بەشیوی کێوەکاندا دێتەخوارێ. ئەم شارە، لە قەد پاڵی کێوکە هەڵکەوتووە و قەڵای مێژوویی ماکۆی خستۆتە ژێرسێبەری خۆی و بەشێک لە کێوەکە وەک کە پرێک بەسەریدا کشاوە. لە داوێنی کێوەکە لە سەرتەختە بەردێک چەند شێعرێک نووسراوە کە ناوی قەڵاو ڕێکەوتی سازکردنەکەی بە دەستی شاعەباسی سەفەویمان بۆ دەگێڕێتەوە. یەکێک لەو شیعرانەی کە ئێستاش هەر لەبیرم ماوە ئەوەبوو: (این قلعه که اسم اوقبان بوو خرب المثل همه جیهان بوو).

واتە: ئەو قەڵایەی کە ناوی قەبان بوو وێردی زمانی خەڵکی جیهان بوو؟

ڕێکەوتی سازکردنی قەڵاکە؛ کە پاش داگیرکردنی ئەم ناوچەیە لەلایەن لەشکری شاعەباسی سەفەوییەوە بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی سەرهەڵدانی کوردەکانی ئەم ناوچەیە سازکرابوون ساڵی ١٠٩٢ی کۆچی نووسرابوو. وشەی ماکۆ لە "مەکۆ" وە هاتووە کە بەرەسەن کوردییە.

قازی محەممەد دوو هاوڕێکانی سێ شەو وسێ رۆژان لە ماکۆ مانەوە و سەردانی سەرۆکی عەشیرەتەکانی، جەلالی و میلان و عەشیرەتەکانی دیکەی ناوچەشیان کردو گوێی لە ویست داخوازییەکانیان گرت و ئەمری کرد بە نێردراوان کاربەدەستانی کوردستان لە پێناو خزمەت بە خەڵک و پاداشتنی رێزی دوولایەنە یان دەگەڵ کاربەدەستانی ئازەری؛ زیاتر تێبکۆشن.

سەرۆکی عەشیرەتەکان کە خەڵکێکی ناودار و ماقووڵ بوون لە ناوچەدا بریتیی بوون لە عومەرخانی جەلالی، شێخ حەسەنی جەلالی و عەوڵا ئاغای سەرۆکی خێڵی میلان و حەسەن ئاغای سەرۆکی خێلی خاکانلوو؛ کە بەو پەڕی دڵنەوایی و گەرمییەوە میوانداریيان کرد.

بنەماڵەی سەرداری ماکۆ لەو ناوچەیەدا لە هەمووان بەناوبانگتربوون؛ ئیقبال سەڵتەنە (سەرداری ماکۆ) لەسەرەتای هاتنە سەرکاری رەزاخاندا لەلایەن ئەوەوە کوژرا.

خاتوو ئاینالی خێزانیشی کە وەک دەڵێن خەڵکی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بوو، لە کۆشکی باخچەی جوق لە چەند کیلۆ مەتریی باکووری ماکۆ دەژیا. داوای لەقازی کرد بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ میوانی بن قازی محەممەد بەو خووخدەی مەزنی و خەڵک دۆستییەوە قبووڵی کردو لە تەک ژمارەیەک لە هاوڕێیانی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ چوونە کۆشکی باخچە جوق. کۆشکەکە بەشێوازی بینا کۆنەکانی دەرەبەگەڕووسەکان و بەدەرکە و پەنجەرە و کەلوپەلی رازاوەوە کە لە رووسییەوە هێنابوو یان لەنێوەراستی باخێک کە پڕبوو لە میوەی جۆراوجۆر، سازکرابوو. دوونهۆم بوو بە

چەند ژوور دالانێک و هەیوانێکەوە کە دەیڕوانی یەسەر باخ و حەوزەکە.

هەرکام لە ژوورەکان بە مۆبلی هاوڕەنگی فەڕشەکەی رازێندرابۆوە. میجی ژوورەکان بە شێوازی شێوەکایی کۆڕوکۆبوونەوەی سەردەمی سەفەوییەکان پڕکرابوو لە نەش و نیگار. هەروەها لە چەند گۆشەی ژوورەکانەوە کولکسیۆنێک لە بەردی جوان و بێوێنە دانرابوو پەیکەری "چینی" یش لە چەند شوێنێک.

بەقسەی خاتوو ئاینالی، خێزانی سەردار، هەر ژوورەی فەڕشی هاوڕەنگ و بەنرخی تایبەت بەخۆ تێدا بووە، بەڵام لەلایەن عەولاخانی تەهماسبییەوەکە سەرلەشکەری سەردەمی رەزاخان بووە و ئەرکی سەرکوت کردنی سەرداری ماکۆی لە ئەستۆ بووە؛ ئەو راخەرانە دەگەڵ زێڕ و گەوهەرەکانی ماڵی سەرداری تالان کرابوو.

پاش ئەم کارەساتە کوڕەکانی سەرداری ماکۆ چوونە تاران و تەنیا یەکێک لە کوڕەکان لەشاری ماکۆ و لە ماڵە کۆنەکەی خۆیاندا مابۆوە.

سەفەری قازی محەممەد بۆ باکووری کوردستان دە رۆژی خایاند بووە هۆی بەهێزتربوونی ورەی کوردەکانی نەوێ و پتەوتربوونی پەیوەندیی دۆستایەتی و هاوکاریی زیاتری نێوان خەڵکی ناوچەکە هەروەها بەڕێزیان فەرمانی وەدەرنانی مەئمورێکی کوردی مەهابادیی دەرکرد بەهۆی ئەوەی خەڵک لێی بەگلەیی بوون. هەروەها لەو سەفەرەیاندا وێرای هەڵسوکەوتی جوامێرانە و پڕ لە خۆشەویستی دەگەڵ کوردەکانی ئەوێ؛ ئازەرییەکانیشی خستە

ژێرکاریگەریی هەستی مرۆڤ دۆستانە و تێگەیشتنی بەرزی خۆیەوە. پێشوازی و چاوپێکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە ئازەرییەکان خۆی پێشاندەری (خووخدەی) ئازادیخوازیی قازی و هۆگریی ئەوان بەپڕ نییەکانی دادپەروەری بەرابەری بوو، کە شانازییان بە دۆستایەتیی کوردەکانەوە دەکرد و لەوانەیە ئەگەرمافی هەڵبژاردنیان پێ درابایە، بەگیان و دڵ ژیانی نێو کوردستانیان هەڵدەبژارد.

لە گەڕانەوەیاندا بۆ ورمێ؛ سەردانی مزگەوتی جامع و هەروەها مزگەوتی سوننییەکانیان کرد. و گرنگییەکی زۆری بە مەسەلری فەرهەنگی و مەزهەبیی ناوچەکەدا. هەروەها بەسەردان و دیتنیی چەند بەرهەمێکی هونەریی هەڵکەندراو لەسەر بەرد هۆگریی خۆی بۆ پاراستنی ئەو بەرهەمانە نیشاندا.

## هەڵسوکەوت لەگەڵ نەیاران

پاش ئەو وتووێژو رێک کەوتنەی لەسەقز دەگەڵ سەرلەشکەر رەزم ئارا کرا و بڕیاردرا کە گەیاندنی خواردەمەنی و بژێو بۆ سەربازگە گەمارۆدراوەکانی ناوچە و راگواستنی سەربازی نەخۆش و ئەوانەی خزمەتیان تەواو دەبێ لەژێر چاودێریی پێشمەرگەکاندا، دابێ و ئەرتەشی بەهیچ چەشنێ، ئیزنی بەهێزو تەیارکردنی سەربازگە گەمارۆدراوەکانی سەردەشت، بانە و میرەدێی نەبێ. ناردنی چەکو چۆڵ و تەقەمەنی بەگشتی قەدەغە بکرێ و پێشمەرگەی کوردستانیش ئیزنی پێشڕەوییان بۆ گرتن سەربازگەکان و ئەو شوێنانە نەبێ کە لەژێر دەسەڵاتی سوپادان. بەڵام هەروەک خووخدەی خودی رێژێم بوو، سوپا بەردەوام

پەیمان شکێنی دەکرد و ئەفسەرەکانی شا بەشێوەی جۆراوجۆر و لە لۆریی خواردەمەنیدا چەکو چەک و تەقەمەنی بەرێدەکرد و جاروباریش بە هێرش و جمووجۆڵ توانایی هێزی پێشمەرگەیان تاقی دەکردەوە و لە نیاز پاکی نوێنەرانی کوردستان کەڵکی ئاوەژوویان وەردەگرت. لە یەکێک لەو راگواستنانەدا کە دژی پەیمانەکان بوو، پێشمەرگەکان، چوار ئەفسەری شایان دەست بەسەرکرد و ناردیان بۆ مەهاباد. یەک لەوانە بەناوی سەرگورد مودەرسی، خەڵکی سنە بوو؟ گەرچی ئەو چوار کەسە دیل بوون و دەبوایە زیندانی بکرێن، بەڵام بەرێزوحورمەتێکی زۆرەوە، دەگەڵیان جووڵانەوە. ئەوانە لە ساختومانی رەحیمزادەی ئێستادا کە ئەودەم یەکێک بوو لە نووسینگەکانی دەوڵەتی کوردستان؛ راگیرابوون و وەک میوان پێیان رادەگەیشتن؛ ئەوان بەرۆژ دەگەڵ پێشمەرگەیەک بەئازادی لەشاردا دەگەڕان - پاش ماوەیەک سەرهەنگ فیوزی، سەرۆک ستاوی سەقز، کە دواتر بوو بە دادوەری دادگای قازی محەممەد سەدری قازی و سەیفی قازی؛ بۆ ئازاد کردنی ئەو چوار ئەفسەرە هاتنە مەهاباد لەلایەن بەرپرسانی حکوومەتی کوردستانەوە بەرێزوحورمەتەوە وەرگیراو بردیانەلای قازی محەممەد و بە دەربڕینی داخ وکەسەرەوە ئەوشتەی وەک راگواستنێکی ئاسایی لەقەڵەم داو داوای لێبوردن و ئازادیی ئەفسەرەکانی کردو قازی محەممەدیش قبووڵی کرد. بەرواڵەت وا دیار بوو هەڵسوکەوتی قازی محەممەد، کاریگەریی ببوو لەسەر ئەفسەرە دیلەکان و سەرهەنگ فیوزی. بە سوپاس و رێزەوە لە مەهاباد رۆیشتن. بەڵام دواتر دیتمان هەر ئەم ئەفسەرانە بە

دوژمنایەتی و بوغزەوە هاتنە مەهاباد و زۆر بەناحەزی دەگەڵ خەڵک جووڵانەوە.

لە زۆر کۆنەوە نێردراوانی دەوڵەت کوردیان هەر بەچاوێکی سووک وەک ئاژەڵ و باڵندە و شتی وا (سەیر کردووە).

دەڵێن ئەوانەی دەچنە راوی کەمتیار، لەبەر ئەوەی کەمتیار لە کونەکەی دا زەری بۆ کەس نییەو هێرش ناکاتە سەرکەس؛ راوچیی فێڵزان و وردە وردە لە وێرالێی نزیک دەبێتەوە و دەستێکی بەسەرو گوێلاکی دا دێنێ و وردە وردە بەرەو لێواری کونەکە پاڵی پێوە دەنێ و لە پڕ فڕێیدەداتە دەرێ و ئەو جارچی پێی خۆش بوو بەسەری دێنێ، نێردراوانی دەوڵەتیش ئاوا لە کوردەکان دەکەن. دێتە ماڵ و زێدەکەیان و بە براکەم براکەم و هەزاران فێڵ و تەڵە کە دەستێکیان بەسەریدا دێنن و هەر دەگەڵ ئەوەی جێ پێیان کراوە بە شێوازگەلی جۆراوجۆر لە نیشتمان و ماڵی خۆیان وەدەریان دەنێی شانازی بەوەوە دەکەن کە هەر چاویان بە نارەزایەتی یا دژایەتییەک بکەن لە ژێر ناوی داگیرکەر و کافر و جودایی خوازدا دەیانرتێنن یا دیل و ئیعدامیان دەکەن و بە هەموو بشێویەک سووکایەتییان پێ دەکەن و ئەشکەنجەیان دەدەن. لەو هەڵخەڵەتاوانەش کە ئامادەن هاوکارییان لەگەڵ بکەن. وەک داردەستێک کەڵکیان لێوەردەگرن. قسەکانی خواجە نووری، دادوەری نیزامیی سوپای ٣ی مەهاباد لە سەردەمی "فەرماندەیی سپەهبود وەرهەرام"دا، دەبێ پەندێک بێ بۆ ئەو جۆرە کەسانە: ئێمە وەک دەسرەکەڵک لەو کەسانە وەردەگرین کە کارمان بۆ دەکەن تاپێویستمان بن کەڵکیان لێوەردەگرین و دوایی فڕێیان دەدەین.

## ئاورێك لە ڕووداوەكانی رابردوو:

لە کۆتاییەکانی ١٣٢٤ی.ە دا، شەڕی دووهەمی جیهانی، بەتێکیشکانی ئەلمان، ژاپۆن و ئیتالیا کۆتایی پێ هات و دەڵەتەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و سۆڤیەت بەپێی ئەو ڕێککەوتنامانەی دەگەڵ ئێران ئیمزایان کردبوون، لەسەر ئەوە پێکهاتن کە شەش مانگ پاش کۆتایی شەڕ لە خاکی بچنە دەرێ.

ئەمریکا و بەریتانیا پاش کۆتایی شەڕ هێزەکانی خۆیان لەئێران کشاندەوە، بەڵام دەوڵەتی سوڤیەت بەهێندەیک هۆ خۆی لێبوارد و ئەرتەشەکەی هەروا لە ئازەربایجان و باکووری ئێران هێشتەوە. نزیکەی مانگێک دوای کۆتایی شەڕە دەوڵەتی ئێران، لە یادداشتێکدا کە بۆ باڵوێزخانەی سێ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی نارد، داوای لە هاوپەیمانان کرد لە ئێران بچنە دەرێ. هەروەک گوتمان ئەمریکا و بەریتانیا بەڵێنی یەکەی خۆیان بردەسەر. کەچی سۆڤیەت چاوەڕێ سەفەری قەواموسەلتەنە بۆ مۆسکۆ بوو. هەموو بڕوبیانووەکەشی بۆ نەچوونەدەر بۆ ئەوە بووگفتی هەڵێنجانی نەوتی باکوور لە سەرۆک وەزیرانی ئێران، وەرگرێ.

قەواموسەڵتەنە پاش هەڵبژاردنی بە سەرۆک وەزیری و پێکهێنانی کابینە رایگەیاند کە بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی دەگەڵ رووسیەو ڕێزی دوولایەنە دەچێتە مۆسکۆ. بەپێی ئەو بەڵێنییەی کە دابووی، رۆژی ٢٩ ی ڕێبەندانی ١٣٢٤،ی.ە وێڕای وەڤدێکی هاوڕێی، چووە مۆسکۆ. ماوەی دەڕۆژان لەوێ دەگەڵ ئیستالین ومولوتۆف وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت وتووێژ و لێدوانیان کرد. قەوام بەدانی بەڵێنیی ئیمتیازی نەوتی باکوور، بە سۆڤیەت. کڵاوی

لەسەر ئیستالین ناو بەوپەڕی زیرەکییەوە بەستنی پەیمانی نەوتەکەی خستە کاتی پێکهاتنی پارلەمان و پەسند کردنی لەلایەن پەرلەمانەوە. پاش گەڕانەوەی قەوام وەفدی هاوڕێ باڵوێزی نوێی باڵای سۆڤیەت بە ناوی سادچیکۆف هاتە ئێران و درێژەی بە و تووێژکاندا و لە ١٥ی.ە خاکەلێوەی ١٣٢٥ ڕێککەوتننامەیەک لە سێ بڕگەدا بەو شێوەیە ئیمزاکرا:

١- هێزی سوپای سووری سۆڤیەت لە ماوەی مانگ و نیوێکدا خاکی ئێران بەجێ بهێڵێ.

٢- پەیمانی دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی ئێران و سۆڤیەت هەتا حەوت مانگی تر پەسندکران بدرێ بە پەرلەمان "شورای میللی".

٣- چونکە کێشەی ئازەربایجان کێشەیەکی نێوخۆییە؛ بۆیەش دەبێ بەپێی یاسای ئێران و لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و پێکهەڵکردن، دەگەڵ خەڵکەکەی هەڵسوکەوت بکەن. قەوم و سەڵتەنە بۆ ئەوەی سۆڤیەت رازی بکا لە ئێران بچێتەدەر گۆڕانکاریی لە کابینەکەی داپێک هێناو سێ کەس لەبەر پرسانی حیزبی توودەی کردە وەزیری خۆی و بە مجۆرە رۆژ لەدوای رۆژ خۆی لە سۆڤیەتییەکانی نزیک دەکردەوە. قەوام لەلایەکەوە بەڵێینی هەڵێجانی نەوتی باکووری دەدا بەسۆڤیەت و لە لایەکیترەوە گفتی بەجێهێشتنی خاکی ئێران و دەستتێوەرنەدانی لە کاروباری ئازەربایجانی لە سۆڤیەت ئەستاند. ئەو بە دانانی سێ کەس لە بەرپرسانی حیزبی توودە لە کابینەکەی خۆیدا سۆڤیەتییەکانی هیوادارترکرد.

حیزبی توودەش کە ئەوکات بە پشتگیری شۆرەوەییەکان ببووە هێزێک لە ئێراندا پشتیوانیی لە قەوام دەدکرد. لەبەرئەوەی خولی چواردە پەرلەمان کۆتایی هاتبوو دەبوو بۆ کۆتایی هێنان بەم سناریۆیە، دیسان هەڵبژاردن بکرێتەوە و خولی پازدەهەم دەست پێ بکاتەوە.

لە نامەیەکدا کە بۆ پاڵۆێزی سۆڤیەتی نارد بۆ پێکهێنانی مەجلیسی پازدەهەم و هەڵبژاردنی نوێنەرانی تازە و دابینکردنی ئازادیی هەڵبژاردن و پاراستنی سندووقەکانی دەنگدان، وەک پێویستییەک داوای ئیزنی نادردنی هێزی سوپا بۆ ئازەربایجان کرد. حیزبی ئێران. حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان و چەند حیزبی دیکە بۆ بەشداریکردن و دەنگ وەرگرتنی زیاتر لە هەڵبژاردندا، خوازیاری پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو بوون؛ قازی محەممەدیش بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە لە تەلەگرافێکدا کە بۆ قەواموسەڵتە نەڕێبەری حیزبی دێموکراتی گێڕان، دوکتور فەرەیدون کە شاوەرز ڕێبەری حیزبی توودە و ئەڵلاهیار ساڵح ڕێبەری حیزبی ئێران و پێشەوەری ڕێبەری حیزبی دیموکراتی ئازەربایجانی کرد. حیزبی توودە. پێی راگەیاندن حیزبی دیموکراتی کوردستان ئامادە یەلەو بەرەیەدا بەشدار و هیوای خواست کە ئەو بەرەیە ببێتە هۆی بەختەوەری و مەزنیی خەڵکی ئێران. پێشەوا؛ سەدری قازی نوێنەری مەهابادی بۆ خولی چواردەهەمی "مەجلسی شواری میللی" وەک نوێنەری بەشی دانوستانە پەیوەندیدارەکان بە بەرە ناساند. بەڵام قوام سەلتەنە دژواریەتی پێکهاتنی ئەم بەرەیەی کرد.

پەیمانی سەرلەنوێی دۆستایەتی و هاوکاریی کوردستان و ئازەربایجان کاتێک ڕێبەرانی کوردستان و ئازەربایجان زانییان هێزەکانی سۆڤیەت بەم زووانە لە ئێران دەچنەدەرێ؛ ڕۆژی ٣ی بانەمەڕی ١٣٢٥ی.ە لەتەورێز لە کۆشکی مەجلیسی میللی ئازەربایجاندا پەیماننامەیەکی هاوکاری و یەکیەتییان لە نێوان کوردستان و ئازەربایجاندا مۆرکرد.

**لەو دانیشتنەدا بە نوێنەرایەتیی نەتەوەی کورد**

١- قازی محەممەد سەرۆکی حکوومەتی کوردستان
٢- حاجی سەید عەوڵای گیلانی زادە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستان.
٣- عومەر خانی شەریفی، سەرۆکی عەشیرەتی شکاک
٤- حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی، وەزیری بەرگریی حکوومەتی کوردستان.
٥- ڕەشیدبەگی جەهانگیری سەرۆکی هۆزی هەرکی
٦- زێرۆبەگی بەهاوڕێ، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستان
٧- قازی محەممەد حیزبی نوێنەری شنۆ

**نوێنەرانی ئازەرییەکانیش**

١- سەید جەعفەری پێشەوەری سەرۆکی وەزیران
٢- محەممەد عەلی شەبستەری سەۆکی (مجلس مالی)
٣- سادق پادگا، جێگیری سەرۆکی فیرقەی دێموکرات
٤- محەممەدبیریا، وەزیریی فەرهەنگ

پەریماننامەی هاوکارییان لە -٧- بڕگەدا مۆرکرد.

سۆڤیەتییەکان لە مانگی بانەمەڕدا بە تەواوی ئێرانیان بەجێ هێشت و هەر لەو مانگەدا چەند وتووێژێک لە نێوان دەوڵەتی ئێران و حکوومەتی ناوچەیی ئازەربایجاندا پێکهات و شاندێک بە سەرۆکایەتی پیشەوەری چووەتاران. چەند نوێنەرێکی کوردستانیشیان دەگەڵ بوو. وتووێژێکی تێروتەسەلیان کرد، بەڵام بێ ئاکام و بە دەستی بە تاڵ گەڕانەوە تەورێز.

هەڵبەت سوپای شا هەر لە رۆژی چوونەدەرێ سوپای سوور لە ئێران ؛ لە بیری گرتنەوەی کوردستان و ئازەربایجاندابوو. هەروەکی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد.

لەو دەمەیدا کە شاندی نوێنەرایەتیی کوردستان و ئازەربایجان لە تاران خەریکی وتووێژو ئاڵوگۆڕی بیروڕابوون و ئاغای موزەفەری فیروز لە تەورێز خەریکی درێژەیی وتووێژەکان و پەیمان بەستن دەگەڵ ئازەربایجان بوو؛ سوپا شا لە ناوچەی سەقز دووجار هێرشیان کردە سەر پێشمەرگەکانی کوردستان و هەردووجاریش بە توندی تێکشکان. قەواموسەڵتەنە پاش ئەوەی دڵنیا بوو لە پشتیوانیی دەوڵەتانی ئەمریکا بەریتانیا و رازی بوونی سۆڤیەت بۆ چوونەدەر لە ئێران، بوار و هەلی بۆ رەخسا هێزە چەکدارەکانی بنێرێتەوە سەر کوردستان و ئازەربایجان و لە خەزەڵوەری ١٣٢٥ی.ه دا شای ناچار کرد، فەرمانی رۆیشتنی سوپا بەرەو ئەو ناوچانە دەربکاو بەو شێوەیە ئەرتەشی شا لەلای زەنجان و خوڕەمدەڕەوە بەرەو ئازەربایجان وەرێکەوت.

فیداییەکانی ئازەربایجان بێ هیچ دەستکردنەوەیەک لە رێوە پاشەکشەیان کردو رێگەی پێشرەویی سوپایان ئاوەڵاکرد. رێبەرانی حکوومەتی ئازەربایجان و ئەو قەفقازییەکۆچەرانەی کە خزیبوونە نێو زۆربەی دەزگاکانی حکوومەتی میللی و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە و شێوازی توندوتیژی کمۆنیتیان لە ئازەربایجاندا بەڕێوەدەبرد، بە دیتنی پێشڕەویی سوپای ئێران، خۆیان نەگرت و بەو لۆری و ترۆمبلانەی پێیان بوون بەرەو ئازەربایجانی سۆڤیەت هەڵاتن و خەڵکی ئازەربایجان کە لەو ماوەیەدا دژی بە رێوەچوونی تێزە کۆمۆنیستییەکان. رێبەرانی فیرقەبوون؛ دەگەڵ بیستنی خەبەری هێرشی ئەرتەش و راکردنی رێبەرانی حکوومەت؛ هەلیان بە دەرفەت زانیی و دەستیانکرد بە کوشتوکوشتاری ئەندامانی فیرقەی دێموکراتی و ئەو کۆچەرییانەی لە ئازەربایجان مابوونەوە.

بەڵام هێزەکانی ئەرتەش لە کوردستاندا بەترس و پارێزەوە دەچوونە پێش. رێبەرانی کوردستان و ئازەربایجان شەوی ١٩ی سەرماوەزی ١٣٢٥ی.ە لە گوندی "خواجەمیر" (نزیکی مەراغە) کۆبوونەوە و کۆبوونەوەکەیان تا دەمی بەیانی درێژەی کێشا. لەوێ بڕیاردرا هێزەکانی ئازەربایجان و کوردستان ئامادەبن بۆ بەرگری و بەرەنگاربوونەوەی هێزی سوپا. بەڵام رۆژێک دواتر سەلامەڵڵای چاودێر، دەزیری پێشووی ئازەربایجان کە دواتر بوو بە پارێزگاری ئازەربایجان؛ هەواڵی تەسلیم و بەزینی ئازەربایجانی بە تاران راگەیاند و هەر ئەوشەوە رێبەرانی حکوومەت و فەرماندە نیزامییەکان بەرەو ئازەربایجانی سۆڤیەت تێیان تەقاند و ئازەربایجان تەسلیم بوو. ئەرتەشی شا ماوەی رۆژێک لە نزیکیی

تەورێز مانەوە بۆ ئەوەی خەڵک بەحیسابی کاربەدەستانی فیرقەو دەوڵەتی ئازەربایجان بگەن. بەشوێن ئەوەدا قەڵتوبڕ لە ئازەربایجاندا وەرێکەوت. رۆژی ٢١ی سەرماوەز سوپا شا چووە نێو تەورێز و کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان بە تایبەتی قازی محەممەد کە پێشڕەویی سوپا و گیرانەوەی ئازەربایجان و کوشتاری تەورێز و راکردنی رێبەرانی حکوومەتی ئازربایجانیان بینی بۆ پێشگیریی لە دووپاتەبوونەوەی وەها کارەساتێک لە کوردستاندا فەرمانی دا بەربەرەکانێ نەکەن.

ئەم بڕیارە لە کۆبوونەوەیەکدا کە بۆ رادەربڕین و سەربارەت بە بەرگری یا چەکدانانی کوردستان لە حەوشەی مزگەوتی هەباس ئاغا؛ کە ژمارەیەکی زۆری خەڵک و کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان و چەند عەشیرەیەکی لێ کۆببۆوە؛ درا.

بە روونکردنەوەی بارودۆخەکە بۆ خەڵک و باسی هەڵاتنی رێبەرانی حکوومەتی ئازەربایجان و کوشتاری تەورێز و هێندێ شوێنی تری ئازەربایجان و هەڵگەڕانەوەی هێندێک لە سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان بە زۆرینەی دەنگی خەڵک بڕیاردرا بەربەرەکانێ نەکرێ. گەرچی زۆریش ناڕازی هەبوون، بەڵام لایەنگرانی ئاشتی و شەڕنە کردن زۆرینە بوون و ناڕازییەکان بە رووگرژییەوە حەوشەیان بەجێ هێشت. هەرکەسەی کەوتە بیری خۆ قوتارکردن لە تۆڵە و تووڕەیی دەوڵەتی ناوەند.

قازی رایگەیاند؛ لە هیچ دۆخێکدا تا دوایین هەناسەی ژیان خەڵک بەجێ ناهێڵێ و دەگەڵ خەڵکی کورد و هاوشارییانی مەهابادیی دادەمێنێتەوە. ئەم لە خۆبوردوویی و بوێرییەی هیوا بەخەڵک

بەخشی و خەڵک هەستیان کرد، قازی محەممەد خۆی هەموو بەرپرسیارەتییەکان وە ئەستۆدەگریَ.

## سەردانواندن بۆ ویستی خەڵك

پاش کۆبوونەوەکەو راوەرگرتن لە خەڵک؛ بەپێی ویست و بۆچوونی زۆرینەی خەڵک بڕیاردرا بەرەنگاری هێزەکانی دەوڵەت نەبنەوە. ژمارەیەک لە نیزامییەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان کە بەپێی گرێبەستی هاوکاریی کوردستان و ئازەربایجان وێڕایی پێشمەرگەکانی کوردستان لە دەڤەری تکاب لەسەنگەری بەرگری دابوون، دەگەڵ تەسلیم بوونی ئازەربایجان و هەڵاتنی رێبەرانی حکوومەتی ئازەربایجان؛ ئەوانیش پاشەکشەیان کرد. پێشمەرگەکانی کوردستان لە بەرەی تکاب و سەقزەوە بە؛ رێکوپێکی سەنگەرەکانیان چۆڵ کرد و بەرەومەهاباد، یا بەرەو شار و دێهاتەکانی خۆیان گەڕانەوە-سوارچاکانی عەشیرەتەکانیش هێندێکیان گەڕانەوە دێهاتەکانیان و هێندێکیان رەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت کەوتن.

واتە هەر ئەوانەی تا دوێنێ خوازیاری ئازادی و دیموکراتی بوون؛ هەرکە دۆخەکەیان نالەباردیت "تویژیان خست" و هەلپەرستانە رووبەڕووی خەڵک و هاوولاتییانی خۆیان بوونەوە. سەرتیپ هومایونی فەرماندەی هێزەکانی دەوڵەت، لە سەقزەوە بەرەو بۆکان پێشڕەوی کرد. قازی و حاجی بابەشێخ بۆ پێشتگرتن لە تێک هەڵچوونی خوێناوی و کوشتوکشتاری لە چەشنی ئازەربایجان کە شاپەرستان و دوژمانی کوردستان حەزیان لێ بوو، بەمەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە چوونە "حەمامیان"ی ملکی مەحموود ئاغای ئیلخانیزادە، بۆ چاوپێکەوتن دەگەڵ سەرتیپ هومایونی و

سەبارەت بە هاتنی هێزەکانی دەوڵەت بۆ مەهاباد، و تووێژولێدوانی بەنرخیان کرد. بۆ وێنە، بڕیاردرا کە پاش چوونەدەری هێزەکانی بارزانی؛ هێزی دەوڵەت بێتە نێو شار. هەروەها سوارەکانی عەشیرەتان لە پێش هێزەکانی دەوڵەتدا، نەیەنە نێو شار. چونکە دەنگۆیەک هەبوو کە سوارەکانی عەشیرەتان بە دنەدانی نەیاران قەستی تێکدەری و ئازاری خەڵکیان هەیە. پێشەوا داوای لە سەرتیپ هومایونی، کرد بۆ پێشگرتن لە هەر چەشنە رووداوێکی تاڵ نەهێڵێ سوارە عەشیرەتیەکان لە پێش هێزەکانی دەوڵەتدا، بێنە نێو شار دەنا بۆ خۆی (هومایونی :و:) بەرپرسیار دەبێ لەبەرامبەر هەر پێشهاتێکدا. سەرتیپ هومایونی گفتی دابووتێ.

قازی محەممەد و حاجی بابەشێخ لەحەمامیانەوە هاتنەوە مەهاباد سەبارەت بە هاتنی ئاشتییانەی سەربازان و چۆنێتی هەڵسو کەوت کردن دەگەڵیان قسەی کرد، رۆژێک دواتر خەبەریان هێنا کە سوارە. عەشیرەتەکان گەیشتوونەتە کلکەی بەگزادان لە سێ کیلۆمەتری مەهاباد دەیانەوێ بێنە نێو شار. خەڵک ئازایانە ئامادەی بەرگری کردن و بەرەنگاری بوون. قازی محەممەد فەرمانی دا شێخ حەسەنی شەمسی بورهان و رەحیمی جەوانمەردی قازی و نووسەری ئەو دێرانە بە ئۆتۆمبێلی تایبەتیی پێشەوا، بچنەلای سەرهەنگ غەفاری کە فەرماندەیی هێزی پێش قەرەوڵی دەوڵەت و سوارکاری عەشیرەتانی لە ئەستۆ بوو؛ و لە ئاوایی "ئیندرقاش" دامەزرابوون. بۆ ئەوەی مەسەلەی قەراروبڕیارێک کە دەگەڵ سەرتیپ هومایونی بوومانە سەبارەت بە چۆنێتی هاتنی هێزەکانی دەوڵەت بۆ نێو شار، بەویش رابگەیەنین. هەڵبەت پێشتریش کاک جەعفەری کەریمی سەرۆک

ستادی هێزی کوردستان مەئموورکرابوو چاوی بەسەرهەنگ غەفاری بکەوێ و لە ناوەرۆکی ئەم رێککەوتننامەیە ئاگاداری بکاتەوەو چۆنێتی هاتنی هێزەکانی بۆ نێومەهاباد، دەگەڵ باس بکا. کیلۆمەتریکمان مابوو بگەینە "ئیندرقاش"، دیتمان دوو جیسپی ئەرتەشی بەرەوڕووومان دێن، گەیشتنێ و، برێک لەولاترەوە رایانگرت. سەرنشینەکانی جیپی یەکەم؛ سەرهەنگ غەفاری و جەعفەر ئاغای کەریمی بوون، دابەزین ، لەئێمەیان پرسی: هێزەکانی بارزانی هەر لەنێو شاردان؟ ئێمەش لەماشێن هاتینە خوارێ و چووینەلای جیپە (سەربازیەکە) یەکە. کە سەرهەنگ غەفاری بۆ خۆی لێی دەخوڕی. شێخ حەسەنی شەمسی بۆرهان. قەرار و بڕیارەکانی نێوان قازی محەممەد و سەرتیپ هومایونیی بیر هێنایەوە. سەرهەنگ غەفاری گوتی: من بەمەبەستی. دیتنی سەرتیپ هومایونی و وەرگرتنی فەرمان، دەچمە مەهاباد. هەڵبەت کاک جەعفەری کەریمیش دەگەڵیان چوو. بە سەرهەنگ غەفاریم گوت: جەناب سەرهەنگ بارزانییەکان هێشتا لە مەهاباد دان، بەپێیی بەڵێنی سەرتیپ هومایونی هێزەکانی دەوڵەت پاش رۆیشتنی ئەوان دێنە نێو شار و لە پێش هێزی دەوڵەتیش دا، عەشایر بۆیان نییە بێنە نێو شار. سەرهەنگ غەفاری، بە توورەییەوە گوتی: جەناب "من لە بارزانییەکان ناترسم. لەوانم مەترسێنە." منیش گوتم: جەنابی سەرهەنگ، نامهەوێ بتانترسێنم، بەڵکو، بەپێی فەرمایش و فەرمانەکانی قازی محەممەد لەگۆڕێ دایە. پاش ئەو قسانە، سەرهەنگ غەفاری و جەعفەر کەریمی بە رێی میاندواو وەڕێ کەوتن.

ئێمەش بەرەو مەهاباد گەڕاینەوە. لە جادەی مياندواو مەهاباد، پێش ئەوەی بگەینە کلکەی بەگزادان، تووشی ژمارەیەک ئاغاوەت. (سەرۆک) ی یەکێک لە عەشیرەتە شۆڕشگێڕەکانی "دوێنێ" بووین کە ئەمڕۆ دەڕۆیشتن نۆکەریتی و گوێ لەمستیی خۆیان بۆ سەرهەنگ غەفاری بسەلمێنن. ئەوانە ئەگەرچی ئۆتۆمبێلەکەی* قازییان دەناسی، بەڵام تەواو ناوەڕاستی جادەکەیان گرتبوو بەریان نەدەدا. شوفێرەکە، ماشێنەکەی راگرت: شێخ حەسەن دابەزی و پێی گوتن: ئەوە شەرم ناکەن، داناڕزێن. هەر دوێنێ نەبوو بۆ دیفاع لە کوردستان پەیمانتان. دەگەڵ پێشەوا بەست؟ ئێستاش کە وادەبەلێنییەکانتان پێشێل کردووە سوور سوور ماشێنەکەی ئێمە دەناسن، بۆچی رێگەکەتان گرتوە و بەرینادەن؟ چەند ئاغایەک بەشەرمەزارییەوە، داوای لێبوردنیان کردو گوتیان؛ نەماننانسیونەتەوە. ئیدی رێگەکەیان بەردا.

لە کلکەی بەگزادان، تووشی ژمارەیەک لە ئاغاوەتی عەشیرەتێکی دیکە بووین کە دەیانویست وەک پێش قەرەوڵ لە شار نزیک بنەوە. هەڕەشەمان لەوانیش کرد و گەڕاینەوە نێو شار. دوایین رۆژی سەرماوەزی ١٣٢٥،ی.ه هێزەکانی دەوڵەت بێ هیچ توندوتیژییەک مەهابادیان گرتەوەو لە سەربازگە و بینای دوخانیات و چەند شوێنێکی دیکەی دەرەوەی شاردا، دامەزران.

پاش دوور رۆژان، سەرتیپ هومایونی، ستادی هێزی گەیاندە مەهاباد و کۆکردنەوەی ئەو چەک و تەقەمەنی لە دەست خەڵک دابوو، داوای یارمەتی کرد لە قازی محەممەد و حاجی بابە شێخ و

* بەهۆی نەبوون یا کەم بوون یا کەم بوونی ئۆتۆمبێل لەو کاتدا لە رووەوە ناسراونەتەوە.

بەر پرسانی حکوومەتی کوردستان بۆ بەشداری لەو کۆبوونەوانەی بەو مەبەستە پێکی هێنان. دوو رۆژ دواتر، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی شاریان دەستگیرکرد و لە شارەوانیی مەهاباددا زیندانیان کردن.

## ماڵئاوایی مێژوویی قازی محەممەد و ژەنەڕاڵ بارزانی

شەوی ١٣٢٥/٩/٢٦ی.ز، ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی و هێزەکەی کە لە شەڕگەی سەقز بوون لە رێگەی بۆکان- مەهابادەوە گەڕانەوە مەهاباد. ژەنەراڵ بارزانی، بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخ و ماڵئاوایی کردن هاتە ماڵی قازی محەممەد.

پاش چەند سەعات قسە و لێدوان و راگۆڕینەوە سەربارەت بەو پێش هاتە تاڵە، ژەنەراڵ بارزانی پێشنیاری بەقازی محەممەد کرد رەگەڵی کەوێ و لە ئێران بچنەدەرێ. بە رێزیان فەرمووی: قوربان! من ئێستاش جەنابت بە سەرۆک کۆماری کوردستان دەزانم و، حازرم لەسەر سەرمت دانێم و لەهەر شوێنێ بێ خزمەتکاربم. مانەوەتان لەشاری مەهاباد لە بەرژەوەندی خۆتان و نەتەوەی کورد دا نییە. ئەو دەوڵەتە جێی متمانە نییە. "قازی محەممەد وێڕایی سوپاس لە ژەنراڵ بارزانی فەرمووی" جەنابی مەلا مستەفا؛ من دەزانم دەوڵەتی ئێران تەواوی رق و قینی خۆی بە من دەڕێژێ و ئیعدامم دەکا. بەڵام بە ئیعدامی من ئازار بە خەڵکی دیکە ناگەیەنێ و لەسەر ئەو وادەو پەیمانەی بەو خەڵکەم داوە لە هیچ بارودوخێکیدا بە جێیان ناهێڵم.

## ئەسپاردنی ئاڵای کوردستان بە ژەنەڕاڵ بارزانی

قازی محەممەد ئاڵاکەی کوردستان، کە لە سەرمێزی کارەکەی بوو لوولەی کردو ماچی کردو دایەدەست مەلا مستەفا و گوتی: ئەو ئاڵایە بپارێزە. هیوادارم ئێوە نەهێڵن بکەوێتە زەوی" ژەنەڕاڵ بارزانی، ئاڵاکەی لەدەست پێشەوا وەرگرت، ماچی کرد و لەسەر سەری داناو تەنیا ئەو ئاڵایە دانەنێ، بەڵکو و رۆژێک لە رۆژان هەڵبکا و بیشەکێنێتەوە. ئەو دیمەنە مێژووییە ئەوەندە دڵتەزێن و بەو حاڵەشەوە جێی رێزدانان بوو کە هەموو ئەوانەی لە ژووری مەحکەمەدا، کۆببوونەوە بە کۆڵ گریان. ژەنەڕاڵ بارزانی پارێزەرانی سەرهەنگ میرحاج و، پارێزەرانی مەلامستەفا و ئەفسەرە کوردە عێراقییەکان لە نێو لافاوی خەم وا یەکەیەکە دەستی قازی محەممەد دیان ماچ کردو ماڵئاواییان کرد. قازی ئەمری کرد با ژەنەڕاڵ بارزانی و هێزەکانی هەرچی پێویستیانە دەگەڵ خۆیانی بەرن. من کە بینەری ئەم تراژیدیا مێژووییەی لێک دابڕانی دوو قارەمانی نەتەوەی کورد بووم هەتا سەرلێوی گۆڕ فەرامۆشی ناکەم.

بۆ سبەی شەوێ، بارزانییەکان بەرەونەغەدە و شنۆ و سنووری عێراق وە وەڕێ کەوتن.

## "دەست بەسەرکردنی قازییەکان"

شەوی دووەهەم یا سێهەم بوو؛ شەو دەرەنگان بوو؛ قازی محەممەد بە پێچەوانەی جاران، نەهاتبۆوە ماڵێ: پاش چەند سەعات ژمارەیەک سەرباز و خزمەتکارێکی کورد، هاتنە ماڵەکەی و گوتیان ئەوشۆ جەنابی قازی تەشریفیان لە فەرماندارییی نیزامیی دەبێ و

هاتووین تەختی خەو (قەرەوێڵە)ی بۆ بەرین. هەر ئەو شەوە قازی محەممەد و حەمە حوسێن خانی سەیفی قازییان دەست بەسەرکرد.

هەڵبەت پێویستە بڵێم: کە چەند ڕۆژ بەر لەوەی سوپا بگاتە شاری مەهاباد، ژمارەیەک لە کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان هاتنە ماڵی قازی محەممەد و سەربارەت بە ڕووداوەکان و پەنابردن بۆ سۆڤیەت یا ڕۆیشتن بەرەو عێراق قسەیان دەگەڵ قازی کرد و رایان لێوەرگرت. بەڕێزیان لە وەڵامیانداوتی: ئێوە ئازادن بۆ کوێ دەچن و هەرچی بە پێویست دەزانن دەگەڵ خۆتان بەرن. بەڵام من لە بەرئەوەی بەڵێنم بە خەڵکی کوردستان داوە کە لە هەموو بار و دۆخێکدا لەگەڵیانبم و یە جێیان نەهێڵم ناتوانم ئەو خەڵکە بە تەمای خوڵای بەجێ بهێڵم و خۆم دەربازکەم. من لێم سوورە دەوڵەتی شا دەمگرێ و دەشمکوژێ. سوپای شا لە گەڕانەوەیدا هەموو رق و قینی خۆی بەمن دەردەکا و ئیدی خەڵک زۆر ئازار نادا. ئەگەر دەستی بە من ڕانەگا تۆڵەی من لە خەڵکی کوردستان بەتایبەتی لە خەڵکی مەهاباد دەکاتەوە. ئەویشمان و بوێرێ و خەڵک خۆشەویستییە کاریگەریی لەسەر زۆر کەس دانا و لە ڕۆیشتنی گێڕانەوە. چەند کەس لە برادەران؛ وەک: کاکە عبدولرەحمانی زەبیحی و سەدیقی حەیدەری و دڵشادی ڕەسوڵی بڕیاریاندا دەگەڵ ئەسەدۆف نوێنەری بازرگانیی سۆڤیەت لە مەهاباد. بچنە باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە ورمێ. بەڵام پاش چوون و خۆناساندنیان، مەئموورانی سوڤیەت وەریاننەگرتبوون و ئیزنی چوونە ژوورەوەیان تەنیابە ئەسەدۆف دابوو. هەر ئەو ڕۆژە لە ئەسەد ئابادەوە تەلەفۆنیان بۆ ماڵی قازی محەممەدی کرد.من گووشیم هەڵگرت.

شتەکەیان بۆ گێڕامەوە و گوتیان بە قازی محەممەدی رابگەیەنە و گوتیشیان؛ ئێمە هەر لێرەوە بەرەو عێراق وەرێدەکەوین. قازی محەممەد هیوای سەرکەوتن و سەلامەتی بۆ خواستن.

ئاغای حەیدەری، پاش شەهیدکردنی قازییەکان و پاش لێبوردنی گشتی لەلایەن شای ئێرانەوە؛ بە نێوبژیوانی مەلا حوسێنی مەجدی هاتەوە ئێران و گەڕاوە شاری مەهاباد؛ جەنابی زەبیحیش هەتا سەرهەڵدانی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران هەر لە بەغدا مایەوە و خەریکی نووسینی قامووسی زمانی کوردی بوو. پاش شۆڕشیش سەردانێکی مەهابادی کرد و لەگەڕانەوەدا؛ بێ سەروشوێن بوو و کەس بەشوێنی نەزانی- بەپێی زانیارییەکان تەواوی کتێب و نووسراوەکانی و هەرچی هەیبووە لە عێراق و لەلایەن حکوومەتی بەعسەوە تالان کراون و لەناوچوون. دلشادی رەسوولیش بەشێوەیەکی گوماناوی کوژرا.

کۆمەڵێک لە کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان، بۆ ماوەیەک لە دێهاتەکانی خۆیان خۆتان مات دا ژمارەیەکی زۆریش لە سەرەتای گیڕانەوەی مەهاباددا لەلایەن رێژیمی دەست بەسەر زیندانی کران و ئەوانی دیکەش نێردرانە بەندیخانەی تەورێز. دوای پاش ماوەیەکی زۆر لە تاوانەکانییان، کەم کراوە و هەروەک پێشەوا قازی محەممەد، پێشبینی کردبوو، خەڵکی ئاسایی شار زیانێکی ئەو تۆیان وێ نەکەوت. هەڵبەت بۆ ئەوانەی کاربەدەستی ئیداری و نیزامی بوون زیندانی و بێ حورمەتی و سووکایەتی پێکردن و بەرتیل ئەستاندن شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام ئیعدام نەدەکران.

## دادگایی کردنی قازی محەممەد

دوای گیرانەوەی مەهاباد لەلایەن سوپا و گیرانی پێشەوا قازی محەممەد و ژمارەیەکی زۆر لەکاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان، سام و ترسێکی قورس باڵی بەسەر شاردا کێشاو کەس بەتەمای سبەینێ نەبوو. هێزەکانی ئەرتەش، پاش ئەوەی بە تەواوی دامەزران دادگاییەکی سەحراییان بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ پارسی تەبار و فەرماندارای نیزامیی مەهاباد و دادوەریی سەرهەنگ فیوزی سەرۆکی ستادی هێز، پێکهێناو دەستیان کرد بە لێپرسینەوەو دادگایی کردنی قازی محەممەد و حوسێن خانی سەیفی و ئەبولقاسمی سەدری قازی لەوەدوا ژمارەیەک لە کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان بە بڕوبیانووی جۆراو جۆرگیران و دران بە زیندانی شارەوانی مەهاباد. زیندانی شارەوانی جێی کەسی نەدەبۆوە. تەنیا دوو قولانج جێگە بۆ نووستن هەبوو. هێندێکیان لە دەرەوەی بەندیخانە لە نێو چەند ژوورێک دا و هەر بەوشێوەیە ڕاگرتبوو. ڕۆژێک دوای گیرانی قازی محەممەد، سەرهەنگ ئایرەم و سەرهەنگ موزەفەری و دەوڵەمەندێکی مەهابادی هاتنە ماڵی قازی محەممەد و ژووری کار و ژوورەکانی دیکەی ماڵی یان سەنگ و سوژن دا و دوو جانتای بچووکی پڕ لە بەڵگەو دیکۆمێنت و نووسراوەی تایبەتی نووسراوەی تایبەتی و هەندێک قەباڵەی موڵک و ماڵیان کۆکردەوە و بردیان. ڕۆژێک دوای ئەو ڕووداوە؛ من و ڕەحیمی جەوانمەردی قازیشی کە لە نووسینگەی پێشەوادا کارمان دەکرد، دەست بەسەرکراین و بردیانین بۆ گرتووخانەی شارەوانی شوێنی دەست بەسەریی قازییەکان هەتا دادگایی کردنی

سەرەتایی؛ (شوێنی ئێستای نووسینگەی قازی موکری و جێی جارانی ددانسازی بەهمەنی بوو).

پاش دادگایی کردنی سەرەتایی؛ هەرسێکیان بۆ سەربازگەی مەهاباد راگواستن و هەتاشەوی شەهیدکرانیان لەوێ زیندانییان کردن. دادگایی کردنەکەیان نهێنی بوو. تاوانبارکردنیان مافی بوونی پارێزەرو دەست راگەیشتن بە بەڵگەی بەرگریکردنیان نەبوو، ئەم تاوانانەی درابوونە باڵیان، پارچە پارچەکردنی وڵات، گۆڕینی ئاڵاو پەیوەندی گرتن دەگەڵ نەیاران بوو. لەو گەشە پڕلە توندوتیژی و رق و قینەدا سێ ئەفسەری ئەرتەشییان بە ناوی پارێزەر "وکیل تسخیری" بۆ دیاریکردن. سەروان شەریف، پارێزەری دیاریکراوی "تسخیری" قازی محەممەد و سەرگوردنەوانی پارێزەری دیاریکراوی سەدری قازی بوو. سەروان شەریف کە بە باوەڕو ئیمانەوە بەرگریی لە قازی محەممەد کرد بوو و ئەم تاوانە هەڵبەستراوانەی بەنا دادپەروەرانەو نامرۆڤانە زانیبوو بۆیە هەر کەوتە بەر رق و تووڕەیی سەرلەشکر هومایونی و فەرماندەرە سوپایان. بەڵام سەرتیپ هومایونی پاش هەرەسی مەهاباد، پلەی سەرلەشکەریی وەرگرت.

نەورۆزی ساڵی ١٣٢٦،ی.ە کە ساڵی پلە پێدانی سەروان شەریف بوو و پلەی و سەرگوردی دەدرایە؛ بە تاوانی دیفاع و بەرگری لە قازی محەممەد، پلەکەیان لێ ئەساندەوە.

قازییەکان داوای سەرلەنوێ پێداچوونەوەیان بە حوکمەکەیاندا کرد و دۆسیەکەیان بۆ پێداچوونەوە ناردیە تاران.

## بارودۆخی بەندکراوان

بەندیخانەی شارەوانی پڕپڕبوو لەبەندیی سیاسی. لێکۆڵینەوە و پشکنین هەر درێژەی هەبوو. هەر ڕۆژەی ژمارەیەک بەندییان دەبرد بۆ لێکۆڵینەوە لە نووسینگەی شارەوانی - پادگان یا فەرمانداریی نیزامی و لەوێ لێپرسینەوەیان لێ دەکردن زۆرجار هەڕەشەیان لێدەکردن و تەنانەت دراکاریش دەکران. قازی محەممەد لەکاتی دادگاییدا، تاوان و بەر پرسیارەتی هەموو گیراوەکانی وە ئەستۆگرت و بە پەڕی نەترسی و لە خۆ بوردووییەوە بە پشکێنەرانی دەگوت: کەس خەتابار نییەو هەرچی کراوە بە فەرمانی من بووە و من هەمو وە ئەستۆ دەگرم.

ڕۆژێکی مانگی ڕێبەندانی ١٣٢٥ی.ه لە حەوشەی بەندیخانە پیاسەمان دەکرد. سەرهەنگ فیوزی، دادستانی دادگا، دەگەڵ چەند ئەفسەرێک هاتە گرتووخانەی شارەوانی و هەموو بەندییەکانی کۆکردەوە و پێی گوتن: نامانهەوێ کەس ئازار بدەین، بەس ئێمە دەمانهەوێ دۆسیەی ئەوکەسانە پڕبکەینەوە کە ئێوەیان ناچارکردووە ئەو کارانەبکەن. ئێوەش پێویستە هەرچی دەیزانن، بیڵێن و دانی پیا بنێن و هەر زانیارییەکی هەتانە بە پشکێنەرانی رابگەیەنن بۆ ئەوەی لە سزاکانتان کەم بکەنەوە. سەرهەنگ فیوزی لە نێو هەمووواندا، ئاماژەی بە من کرد کە لە پشتەوەی بەندییەکانەوە وەستا بووم و گوتی: بۆ وێنە ئاغای هومایوان، نابێ خۆی بۆ خەڵک بەدبەخت و چارە ڕەش بکا. دەبێ هەرچی دەیزانێ بە پشکێنەرانی بڵێ. پاش ئەو قسە ئاژاوەگێڕی و دووبەرەکی

سازکردنەی کە بووە هۆی چارە رەشی ژمارەیەک لە گیروان: ئیدی لێی دار رۆیشت.

رۆژێک لە کاتێکدا کە سەروان کۆپاڵ لێپرسینەوەی لێدەکردم دەستی دەگیرفانی ژاکێتەی نیزامییەکەی ناو ویستی قەڵەمەکەی دەرهینی، بەڵام، برێک تلیاکی لێکەوتە خوارێ و لە لای من زۆر تەریق بۆوە رووی تێکردم و گوتی: شوکرێ خودا ئەوە جارێ بۆ هیچ شتێ نابێ نەخۆشم و بۆ دەرمان هەڵم گرتووە. دوایی لاپەڕەی لێپرسینەوەکەی لە پێشم دانا و گوتی چیت پێخۆشە بینووسە. منیش گوتم: جەناب سەروان، پرسیارەکانتان بفەرموون با وەلامەکانیان بنووسمەوە. ئاشکرابوونی ئەم نهێنییەی سەروان، بووە هۆی ئەوەی کە، چەند پرسیارێکی سادەم لێ بکا. ئەگەرچی ژوورەکانی بەندیخانە بە هۆی زۆربوونی ژمارەی گیراوانەوە، زۆر بەرتەنگ بوون، لە دەوری یەکتر کۆدەبووینەوە و سەبارەت بە چارەنووسی خۆمان قسەمان دەکرد. ئاغای ئیبراهیمی نادری، کە پیاوێکی کرماشانیی خوێندەوارەو گەلێک تێگەیشتوو بوو و بەهۆی عەشق بە ئازادیی کوردستان لەوێوە هەستا بوو، هاتبووە مەهاباد و جێگری وەزیری فەرهەنگی کوردستان بوو؛ بەو زانیارییە قووڵەی کە هەیبوو، رێنونی دەکردین و بەپێی یاسای ئێران ئاستی سزاو تاوانەکانی بۆ لێک دەدانینەوە.

زیندانییەکی دیکەش بەناوی جەوداکازمی کە ئەویش کرماشانی بوو، پیاوێکی قسە خۆش بوو، شەوانە لەسەر باڵنجێک دادەنیشت و چیرۆکی بۆ کورەکان دەگێڕایەوە و بە گاڵتە دەیگوت: "هیوادارم

خودا ماددەکانی (بڕگەی قانوون)* ئاغای نادری بکاتە نێرینە. گاڵتەکانی ئەو دەبووە هۆی دڵخۆشی و پێکەنینی کوڕەکان بیرەوەرییەکی دیکەشم لەو دەمگۆ سازییانەو ترس وەبەر نان و توقاندنانەی بەندیخانە لەبیرە و پێموایە مەئموورەکان وایان دەکرد. لەوانەیە گێڕانەوەکەی بۆ باشتر روون بوونەوەی بارودۆخی بەندییەکان پێویست بێ.

پاش لە سێدارەدانی و شەهیدکردی (١١) کەس لە بنەماڵەکانی فەیزوڵلابەگی و جەوانمەردی و ئەسعەدییەکانی لە سەقز و خوالێخۆشبوو، عەلی بەگی شێرزاد، فەرماندەی، پێشمەرگەکانی بۆکان؛ ماوەی چەند شەوێک دەمگۆی ئەوە بوو کە لەو یەک دوو شەوانەدا، چەند کەسێک لە سێدارە دەدرێن. ئەو دەمگۆیانە زۆر کەسی نیگەرانی چارەنووسی خۆی کردبوو. کوڕەکان بەو جێ تەنگییەوە لە پاڵ یەکەوە رادەکێشان و بەوپەڕی شەکەتیی دەروونییەوە؛ دەست لە ئەستۆی هەزاران خەونی ئاڵۆز خەو یان لێ دەکەوت.

## لێپرسینەوەیەکی بێ بەزەییانە

شەوێک لەو شەوانە؛ بەبیستنی دەنگێک کە لەدەرەوەی ژووری زیندانەوە هات وەخەبەر هاتم. گوێم لێبوو یەکێک بانگم دەکا. پاش چەند چرکەیەک دەنگی گرووبان مەحموودیم ناسییەوە -سنەیی بوو- گوتم: سەرکار مەحموودی، بەو سەعات سێ و نیوە چ کارێکتان پێمە؟ لەو دیو دەرگەوە گوتی: بەزاتی خودا، جەناب

* ماددە: لە فارسیدا گەلێک مانای هەیە وەک: مێوینە -ماک- بڕگەی یاسایی. لێرەدا کازمی تەنیا بە مانای "مێو" گرتوویەتی.

سەرهەنگ لە ژووری کارەکەیەتی و داوای کردووی. من چم لەدەست نایە. لە دەنگەدەنگی من و سەرکار مەحموودی هەر ١٦ کەسەکەمان کە لە دیوێکی ٣/٥ لە ٤/٥دا خەوتبووین وە خەبەرهاتن و بەو دەمگۆیانە، کە لە زینداندا بڵاو ببوونەوە، هەمووان لێیان سوور بووە بۆیە دەمبەنەدەرێ تا لە سێدارەم بدەن. دەرگای ژوورەکەم کردەوە و لە نێو تەوژمی خەمی کوڕەکاندا، چوومەدەرێ. دەگەڵ سەرکار مەحموودی چووینە نێو حەوشەی یەکەم پێنج سەرباز تفەنگەکانیان خستە سەر پێ و دەوریان دام. ئیدی گومانم بۆ نەما لەوەیکە من یەکێک لەوانەم کە لە دار دەردێن. لە پلیکانەکان هاتمە سەرێ. و چوومە نێو کریدۆری شارەوانی- لۆرییەکی سوپا دی کە لەوێ راگیرا بوو: گومانم نەمالەوەیکە بەو ماشێنە دەمبەنە سەربازگە. یا شوێنێکی دیکە بۆ سێدارە. راست بەرەو لۆرییەکە رۆیشتم و لە شارەوانی چوومەدەرەوە. بەڵام، سەرکار مەحموودی تێیگەیاندم کە جەناب سەرهەنگ لە ژوورێ چاوەڕێمەوە منیان برد بەرەو ژووری سەرۆکی "دێژبان" کە لە بینای شارەوانیدا بوو.

لەوەژوورکەوتندا، دیتم سەرهەنگ پارسی تەبار "فەرماندارى نیزامی"، کە پیاوێکی تووڕە و تۆسن و جنێو فرۆش و رەقاوی بوو، لە پشت مێزێکەوە لە ژوورەکە دانیشتووە. ئاغای ئیعتماد زادەش کە ئەفسەرێکی کە لەگەت و تێگەیشتوو بە حورمەت بوو لە تەنیشت مێزەکە راوەستابوو.

سەرهەنگ دەستی خستبووە گیرفانی باڵتەکەی و جەللادانە بە سەروان ئیعتماد زادەی گوت: کورسییەکی بۆ دانێ، (بەو جۆرە

سەرهەنگ لەلایەک و ئیعتماد زادە لەلایەکی دیکەوە من لە لایەکەوە دانیشتین) سەرهەنگ ڕووی تێکردم وگوتی: ورد چاولێکە بزانە دەڵێم چی؟ هەر پرسیارێکی لێتی دەکەم، جوان وەڵامی بدەوە.

لەسەر کورسییەکە دانیشتم. سەرهەنگ بێ پێچ و پەنا بە ئیعتماد زادەی گوت: جەناب سەروان؛ ڕۆحی ئەوانە بۆ پیاو کوژی جەنایەت خوڵقاوە.

سەروان ئیعتماد زادە چاوێکی لێکردم یانی من لەوەدا بێ تاوانم بەو قسە بۆ غزاوییانەی سەرهەنگ، زۆر تێک چووم. بەو قسەیە راوام لێهات ترس لە دێم دەرهاوێم. پێموابوو هەر سەعاتێکم ژیان ماوە. دەی لەچی بترسم. کتوپڕ واوە غیرەت کەوتم هەر بۆ خۆشم پێم سەیر بوو. گوتم: بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان حازرم. سەرهەنگ زیاتر تووڕەبوو. پرسیارەکانی هێنایەگۆڕێ سەروان ئیعتماد زادە دەینووسین- وەڵامەکانی منیشی دەنووسییەوە پاش سەعات و نیوێک لێپرسینەوە پێی گوتم: دەی باشە، قسەکانت مۆرو ئیمزابکە. گوتم ئیزن دەدەن قسەکانم بخوێنمەوە؟ سەرهەنگ بە تووڕەییەکی زیاترەوە گوتی؟ ئەی بێ پێداچوونەوە چۆن مۆری دەکەی؟ ئەی جینایەتکاران ئەی پیاو کوژران! سەروان، نەمگوت ڕۆحی ئەوانە بەس بۆ جینایەت و پیاوکوژی خوڵقاوە - من هەر گوێشم لە جنێوەکانی نەدەگرت. هەڵبەت زۆر تۆورە بووم. یەک زەرە لە مەرگ نە دەترسام. بە قسەکانمدا چوومەوەو ئیمزام کرد و هەستامە سەرپێ. سەرهەنگ بە تووڕەییەوە بە سەروان ئیعتماد زادەی گوت؛ ئەو کابرایە. ئیعتماد زادە دەرگاکەی تەنیشتی کردەوە. دیتم محەممەدی تۆکمچی کە ئەوکات (بەڕێوەبەری

کارەبای مەهاباد بوو لە) دیوەکە هاتە دەرێ. تۆکمەچی لەسەرەتای دامەزرانی حکوومەتی کوردستاندا؛ بەرپرسی چەکو تەقەمەنی سەربازگەی مەهاباد بوو. کەس نەیدەزانی لەو شەوە سەیرەدا سەرهەنگ چی خوارد بۆ وە و بۆچی ئاغای کمەچییان لە کارخانەی کارەباوە هەڵگرتووەو هێناویانەتە شارەوانی و پاش لێپرسینەوەیەکی زۆر لەسەر دابەشکردنی چەک دەیەوێت دەگەڵ من رووبەڕووی کاتەوە؟ کورتی بڕینەوە ئەو شەوە نا چاربووم، لەدووی بەشێک لە قسەکانی تۆکمەچی بدەم. بڕێکییشی وەدرۆخەمەوە. چونکە ئەو چەکانەی تۆکمەچیم وەرگرتبوون، دابوومن بە کەسانێک کە نەمدەویست، چەرمەسەریان بۆ سازبێ و ئەوانەش کە لە زینداندا بوون، تووشی چەرمەسەریی زیاتریان بکەم. ناعیلاج گوتم من چەکم بە پێی ژمارە وەرنەگرتووە.. ئاغای تۆکمەچی گوتی؛ چەند کۆڵتێک لەو سندووقانە دایە، منیش نەمئەژماردن بە چەند پێشمەرگەم گوت بیخەنە نێو ماشێنەکە. ئاغای تۆکمەچیش کە پیاوێکی زۆر باش بوو، خۆی گوتبووی تەنیا چەند چەکێکم دوانەتێ. سەرهەنگ پاش رووبەڕووبوونەوە و مشت و مڕانە پێیی گوتم: ئێوە ئاگاداری هێندێ شت هەن و لە سەفەرەکانی قازی محەممەدشدا لەدووادان: واتە تەئیدکردن.

دەگەڵیان بووی. دەبێ ئەوەی دەیزانی بەنووسراوە بماندەیتێ. دڵنیایە گەربێت و ئەرکارەبکەی، لە سزاکەت کەم دەکرێتەوە، بەڵام ئەو زانیاریانییەمان پێنەدەی بەدبەختت دەکەم. گوتم؛ من هەرچی زانیومە لە وەڵامی پرسیارەکاندا وتوومە. لەوەش زیاتر هیچ نازانم، نازانم تابڵێم. سەرهەنگ گوتی: بچۆوە زیندان، دڵنیابە چارە رەشت

دەکەم. بە بیستنی "بچۆوە زیندان" پێموابوو سەرهەنگ حکوومی ئازادیی منی داوە، چونکە من تەواو دەستم شۆشتبوو چاوەڕێ سێدارە بووم. دەگەڵ سەرکار، مەحموودی چوومە دەرێ و چۆنی هێنابوویانم، ئاواش بردمیانەوە زیندان. هەر دەگەڵ گەیشمتەوە و گوتم دەرکەم لێ بکەنەوە؛ چەند کەسیان وێکراو بە سەرسووڕماوی گوتیان؛ کوڕە ئەوە هاتییەوە؟ بە خۆشحاڵییەوە گەتم؛ ئەی چاوەڕێ بوون نە گەڕێمەوە؟ گەڕانەوەم بوو هۆی خۆشحاڵی رۆستان و تا بەیانی کەس خەوی لێنەکەوت. هەمووی هەر باسی ئاکاری نامرۆڤانەی سەرهەنگ و ئەو لێپرسینەوە بێ وەختەبوو. بۆ بەیانی یەکەی؛ بەندییەکانی دیکەش کە کاک سەید محەممەدی سەیدی ئاگاداری کردبوون، هاتنە دیتنم و خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕی.

هەر ئەو رۆژە لە لێپرسینەوەی رۆژانەدا، کاک برایمی نادری ناڕەزایەتیی خۆی لەو کارە ناجوامێرانەیەی سەرهەنگ دەربڕیبوو و پێشکێنەرەکانی ئاگادار کردبۆوە.

زۆر لەوانەی ئەوکات، لەوێ بوون ئێستاش زیندوون زۆریشیان بەجێیان هێشتووین. لەو شەوەرا یەکێک لە هاودیوییەکان بە ناوی ئوستوار ئەحمەدزادە بە شمەکەوە دەخەوت: کوڕەکان دەیانگوت؛ بۆ شمەکان داناکەنی؟ دەیگوت. ئەگەر شەوێک بانگیان کردم بمبەن بۆ سێدارە و من بۆم نەکرا، شمەک دەبەرکەم، لەوانەیە ئێوە لۆمەم بکەن و پێتان وابێ خۆم دۆڕاندوە و دەی چ باشتر هەر بە جل و بەرگەوە بخەوم.

## "وەبیرخستنەوەی چەند خاڵ"

وەکور گوتم؛ چوونە دەرێی سوپا سوور، لە ئێران؛ بە هۆی گوشاری ئەمریکا و بەریتانیا و سکاڵای ئێران بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش و لە هەمووان کاریگەرتر، قاییل بوونی قەوام بەویست و داوای سۆڤیەت، بۆ دانی ئیمتیازی هەڵێنجانی نەوتی باکوور بوو. دەوڵەتی سۆڤیەت کە بەدرۆ خۆی بە رێبەری بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی جیهان. بە تایبەت ئازەربایجان و کوردستان دەی زانی، بە قەوڵ و قەوارێکی نیوە چڵی قەوام، دەستی سوپای شانشایی بۆ گرتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان ئاوەڵاکرد و وەک هەمیشە دۆستەکانی خۆی کردە قوربانی و فیدای بەرژەوەندییەکانی ئایندەی.

هێرش و پێشڕەویی سوپا شا، بەرەو ئازەربایجان و کوردستان، بەزینی فیداییان و فیرقەی دیموکرات، تۆڵە ئەستاندنەوە و کوشتاری فیرقەییەکان لەلایەن خەڵکەوە، لە تەورێز و شارەکانی دیکە، بوونە هۆی هەڵگەڕانەوەی بەشێک لە سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان و چۆڵکردنی بەرەکان و پەیوەندییگرتنیان بە ئەرتەشی "شا" وە و پێ رێخستنیان لەوادە و بەڵێنییەکانی پێشوویان. حەمە رەشیدخانی فەرماندەی ناوچەکانی سەقز، بانە و سەرا، لە ئێران هەڵات و چووە عێراق و رەعیەتەکانی خۆی و ، ژمارەیەکیش لە بەگزارەکانی بانەی رەگەڵ کەوتن. عومەر خانی شەریفی، یەرۆکی هۆزی شکاکیش، گەڕایەوە بۆ ئاوایی "زیندەشت" و بەگزادەکانی شکاکیش بە شوێنیدا لە بەرەی سەقز کشانەوە و چوونەوە دێهاتکانی خۆیان. دەستەیەک لە ئاغاکانی دێبوکری پردەکەی نزیک

بۆکانیان کە تاقە پردی پەیوەندیی بۆکان و مەهاباد بوو؛ ئاگردا و چوونەپاڵ هێزەکانی دەوڵەت کە لە ژێر فەرماندەیی سەرتیپ هومایونی دابوون. ئەو رووداوە تاڵانە بوونە هۆی ئەوەی قازی محەممەد، خەڵکی شار و بەشێک لە عەشیرەت و کارەبەدەستانی حکوومەتی کوردستان. کۆبکاتەوە بۆ لێکدانەوەی بارودۆخ و بڕیاری دان لەسەر ئەو رووداوە و پێشهاتە تاڵانە - خەڵک لە حەوشەی مزگەوتی هەباساغادا بۆ بیستنی قسەکانی قازی محەممەد، کۆوەبوون.

## پشتگیریی لە کارەساتێکی مرۆڤایەتی

چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرتیپ هومایونی و رێگەنەدان بەهاتنی سوارکارانی عەشیرەتان بۆ نێو شار بەر لە هاتنەوەی سوپا تەواوی نەخشەکانی نەیارانی بۆ کوشت و کوشتار و تاڵان خوڵقاندن هەڵوەشاندەوە. غیرەت و لە خۆبووردەیی و مانەوەی وەبەر خەڵکدا؛ کەسایەتییەکی ئەبەدییان بە قازی محەممەد بەخشی، بۆیە هەتا رۆژگار کۆنتر دەبێ بیری بوێری و پابەندیی ئەخلاقیی پێشەوا بە بەڵێنەکانی زیاتر دەدرەوشێتنەوە.

### لە سێدارەدانی قازییەکان

قازی محەممەد و سەدری قازی و سەیفی قازی، داوای دیسان پێداچوونەوەیان بە حوکمی (بڕیاری) دادگای سەرەتایی (بدوی) نیزامیدا کردو داوایان کردبوو کە بۆ دادگای پێداچوونەوە بیان نێرنە تاران، بەڵام سوپا لە ترسی ئەوەی نەکا، ناردنی قازییەکان بۆ

تاران، ببێتە هۆی پێداچوونەوە و کەمکردنەوەی سزاکانیان و (لە دارنەدرێن)، ئەو داوایەی قبوڵ نەکرد. دوای ماوەیەک دادگایەکی بەسەرپەرشتیاریی سەرهەنگ عەتایی و دادوەریی سەرهەنگ نکوزاد، پێکهێنا پارێزەرە دیاریکراوەکانیان "(تسخیری)" سەروان سولح جوو سەروان نەبەوی بوون.

قازی محەممەد لە هەردوو دادگادا لە پێگەیەکی مافخوازانەو وەک قارەمانێکی نەتەوەیی. بوێر و سەربەرز داکۆکی لە خۆی و هەمووکابەردەستانی حکوومەتی کوردستان کرد و ئەو تاوانانەی وەدرۆخستنەوە کە دابوویانە پاڵی و زۆر، جاران دووپاتی کردەوە کە: من ناوچەکەم لە کوشتارو قەڵت و بڕپارست و شمەکی ئاساییم دابە سەربازەگانی ئێوە و ناردومەوە بۆ باوەشی بنەماڵەکانیان. ئەو کەسانەی ئێوە ئێستا گرتووتانن هەمووبێ تاوانن و بەقسەی خۆشتان هەر تاوانێکی هەشیانە، ئەوە بەقسەوفەرمانی من کردوویانە و من تاوانی هەمووان وەئەستۆ دەگرم. منیش ئەو کارانەم لەبەر نیشتمان و خەڵک و نەتەوە هەژارەکەم کردووە. من مەهاباد و کوردستان موکریم لەسەردەمانێکدا کە بۆ شایی دەسەڵات بەسەریدازاڵ بوو و کەس خەتی کەسی نەدەخوێندەوە و سوپا و دەوڵەتی لێ نەبوون؛ لە مەترسی قاتی و قڕی ئاڵۆزی و شێواوی پاراست و نەمهێشت خوێنێک بڕژێ.

ئەوەندەشم خزمەتی فەرهەنگی (رۆشنبیری. و.) و پەروەردەیی و ئابووری کردووە کە دۆست و دوژمن، سەریان لێی سووڕماوە.

قازی محەممەد، ماوەیەکی زۆر لە بەرامبەر تۆمەتەکانی دادوەردا؛ داکۆکیی لە خۆی کرد و پێویستیی بە پارێزەر نەبوو. ئەو دەمەی سەرهەنگ نکوزدا؛ دادوەری نیزامی دادگای پێداچوونەوە، قازی محەممەد تاوانبارکرد بە خیانەت بە وڵات و بەوپەڕی بێ شەرمییەوە کوردەکانی بە "سەگ سیفەت" ناوبرد؛ قازی محەممەد، بە چاو نەترسییەکی بێوێنەوە کورسییەکی ژێر خۆی هەڵگرت و تێی هەڵکرد و بەناڕەزایەتییەوە گوتی: من ئیزنت پێ نادەم، سووکایەتی بە نەتەوەکەم بکەی، ئەوە ئێوەن خەیانەت بە میللەتەدەکەن؛ خەڵک دیل دەکەن. هەرکەس خوازیاری ئازادی و مافی خۆی بوو، راپێچی بەندیخانەی دەکەن و لەسێدارەی دەدەن. ئێوەن هێرشتان کردۆتە سەر شار و وڵاتی ئێمە و ئێمە کە مافی ژیان و ئازادیمان هەیە، دەمانخەنە بەندیخانە و تۆمەتی خەیانەتمان لێدەدەن. ئەوە ئێوەن دەبێ موحاکەبکرێن نەک ئێمە.

چاونەترسی و بوێریی قازی حەممەد وا بەسەر دادگا زاڵ بوو، کە بەرپرسانی ئەم دادگا رواڵەتیە ناچاربوون بەبیانووی پشوودان دادگا راگرن.

دواجا؛ بێ لەبەر چاوگرتنی داکۆکی کردنی یاسایی و بێ رەچاوکردنی پێوەرە ئەخلاقی، شەرعی و دیموکراتیکە باوەکانی دونیا، بڕیاری لە سێدارەدرانی قازییەکانی هەر لەلایەن ئەو دادگادژی گەلییەوە دراو بۆ ئیزن خواستن دەقی بڕیارەکەیان ناردە تاران. ستادی سوپا کە لە بەڕێوەبردنی بڕیاری دادگای پێداچوونەوە، بە پەلەی بوو. فەرمان و ئیزنی راستەوخۆی حەمەڕەزا پەهلەوی بەرێوەچوونی خێرای بڕیارەکەی پەسند (تەئید) کرد. بەو جۆرە

ئەفسەرە بە کرێگیراوەکانی شا؛ لە بەرەبەیانی رۆژی دووشمە ١٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ی.ە بەرامبەر–١٩٤٧ی.زاین، لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد، قازی محەممەد، سەدری قازی و سەیفی قازییان لە سێدارە داو شەهیدیان کردن و بەمجۆرە پەڵەیەکی رەشی دیکەیان لە تەوێڵی رژێمی سەرەڕۆی پەهلەوی دا. شەوی دووشەممە ١٠ی خاکە لێوە لە حاڵێکدا خەڵک لە کەشێکی پڕ، ترس و سەرکو حکوومەتی نیزامیدا خزابووتە ماڵەکانیانەوە؛ جموجۆڵێکی نائاسایی لە گۆڕەپانی چوارچرا هەست پێدەکرا. هەموو سەربان و ئەورێیانەی دەچوونەوە، سەر گۆڕەپانەکە، لەلایەن سەربازە چەکدارەکانەوە گیرابوون. چەند دارتاشێک لە گۆشەی باکووریی گۆڕەپانەکەوە، خەریکی چەقاندنی داربوون. بێجگە لە ماڵەکانی دەوری مەیدان کە بەزەبری چەک لە خەویان هەستاندبوون و سەربازەکانیان لەسەربان و بەرپەنجەرەی ئەو ماڵانە دامەزراندبوو، کەسی دیکە ئاگاداری ئەم دۆخەنەبوو. لە نیوە شەو بەولاوە لە سەبازگەو بەندیخانەی قازییەکانیش هێندێ جموجۆڵی نائاسایی دەبینران. چەند لۆریی پڕ لە سەربازی چەکدار دەست لەسەر چەک چاوەڕێی فەرمان بوون. کتوپڕ درگای ژووری زیندانی قازی محەممەد دەکەنەوە و پێی دەڵێن خۆیان حازرکەن دەیانمەوێ بەڕێیان بکەن و بۆ تاران.

قازی محەممەد، بە سەر سوڕماوییەوە، دێتەدەرێ و بە جیپێکی سوپا و لە نێوان دوولۆریی پڕ لە سەربازی چەکدار دەیهێننە شوێنی جارانی نووسینگەی حیزب کە کراوەتە فەرمانداری (بینای شارەدرای ئێستا). لە پێشەوا مەلایەکی مەهابادی بەناوی مەلا سەدیقی سیدقی، ئیمام جومعەی مزگەوتی هەباسانی یان هێنابووە ئەوەێ قازی

محەممەد بە دیتنی مەلا بە دەرخۆنە کردنی لە سێدارەدانەکەی بووە. سەدیق و فەرماندارى نیزامی لە شانۆی "ناردن بۆ تاران" تێدەگا و دەزانێ هەمووی ئەوکارانە بۆ دیزە بە فەرمانی سەرهەنگ حوکمی لە سێدارەدانی بەدەخوێندرێتەوە و داوالەی لێدەکرێ لە حزووری مەلادا هەر وەسیەتێکی هەیەتی بیکا. مەلا سەدیق و ئەو ئەفسەرانەی لەوێ بوونە گەلێک لەسەر بوێری و غیرەتی قازی دواون- قازی محەممەد، قارەمانە و بە بوێری و غیرەتی رێبەرێکی نەتەوەییەوە، دەگەڵ مەرگ رووبەڕوو دەبێتەوە. "پێشەوا" لە وەسیتنامە سیاسییەکەیدا، باس لە خەباتی پڕ لە شانازیی خۆی لە پێناو رزگاریی نەتەوەی کورد دەکاو داولەانەوەی داهاتوو دەکا کە درێژە دەری رێگەکەی بن- لە وەسیەتنامەیەکی دیکەدا کە بەدەستوخەتی مەلا سەدیق نووسراوە. و خۆی مۆری کردووە؛ باسی لەکاروباری کەسیەتی (شخصی) و تایبەتی و بنەماڵەیی خۆی کردووە و دەقی ئەوەیان هەرماوە، بەڵام وەسیەتنامە سیاسییەکەی لەلایەن نێردراوانی "شا" وە نێردرایەتاران و لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی سوپادا رایانگرت و بڵاویان نەکردەوە:

دەقی وەسیەتنامەکە دواتر بەمجۆرە بڵاوکرایەوە:

## وەسیەتنامەی سیاسی قازی محەممەد*

### بسم الله الرحمن الرحیم.

میللەتی کورد؛ رۆڵەی برا عەزیزەکانم، برابەش خوراوەکانم، میللەتە زوڵم لێکراوەکەم؛ وام لە دوایین ساتەکانی ژیانمدا. چەند

* ئەم دەقە لە کتێبی "سەرۆک کۆماری کوردستان لە بەردەم دادگای ئێراندا" نووسینی بەدرەدین ساڵح وەرگێڕاوە. (چاپی چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر ٢٠٠١).

ئامۆژگارییەکتان دەکەم، وەرن بەخاتری خودا، چیتر دوژمنایەتیی یەکتری مەکەن. یەک بگرن و پشتتان وە یەکتری بدەن، لە بەرامبەر دوژمنی زۆردار و زوڵم بوەستن، خۆتان بە خۆڕایی بە دوژمن مەفرۆشن، دوژمن هەر ئەوەندەی ئێوە دەوێ، تاکاری خۆی پێ جێبەجێ دەکاو قەت بەزەیی پێتاندا نایە، لەهەر هەڵێکدابێ، قەت لێتان نابووری.

دوژمنانی گەلی کورد زۆرن، زاڵمن، زۆردارن، بێ بەزەین، رەمزی سەرکەوتنی هەرگەڵ و نەتەوەیەک یەکگرتن و یەکبوونە، پشتگیریی تەواوی میللەتە. هەر میللەتێک یەکێتی و تابایی نەبێت، هەردەم ژێردەستی دوژمنانی دەبێ. ئێوە گەلی کورد، هیچتان لە گەلانی سەر ئەم گۆی زەمینە کە مترنییە، بەڵکوو لە پیاوەتی و غیرەت و لێهاتوویی؛ لەزۆر لەو گەلانەی کە رزگاربوون لە پێشترن. ئەو میللەتانەی کە لە نگی دوژمنە زۆردارەکانیان رزگاریان بوو؛ وەک ئێوەن، بەڵام ئەوانەی خۆیان رزگار کردووە؛ یەکێتیان لە نێواندا هەبووە؛ با ئێوەش وەکو هەموو گەلانی رووی زەوی؛ چیتر ژێردەست نەبن، هەر بەیەکگرتن و عەسوودی بەیەک نەبردن و خۆنەفرۆشتن بە دوژمنان، لەدژی نەتەوەکەمان دەتوانن رزگاربن-

راکانم، چیتر فریوی دوژمن مەخۆن، دوژمنی، کورد لە هەر رەنگ و دەستەو قەومێک بێت؛ هەر دوژمنە، بێ روحم، بێ ویژدانە، روحمتان پێ ناکا، بەیەکترتان بە کوشت دەدا، تەماحووەبەردەنێ. بەدرۆ و فرەفێڵ بەگژ یەکترووداەکا، لەناو هەموو دوژمنەکانی گەلی کورد، دوژمنی عەجەم لە هەموویان زاڵمتر و مەلعووتنر و

خوا نەناستر و بێبەزەییترە؛ لە هیچ تاوانێک بەرامبەر بەگەلی کورد دەست ناگێڕێتەوە؛ هەر بە درێژایی مێژوو لەگەڵ گەلی کورد غەرەز و کینەی ریشەداری هەبووە و هەیەتی، تەماشاکەن، تەواوی گەورە پیاوانی گەلەکەتان، لە سمایل ئاغای شکاکەوە بگرە؛ تا جەوهەر ئاغای برای و هەمزە ئاغای مەنگوڕو چەندین مرۆڤی دیکە؛ هەر هەموویان بە فریودان ئارامیان کردنەوە و خەڵکیان لەپشت کردنەوە و ئینجا زۆر زۆر نامەردانە، کوشتیانن، هەموو ئەوانەیان بە سوێند و قورئان فریودان کە گوایە عەجەم؛ نییەتی خێری لەگەڵیاندا هەیە و چاکە یان لەگەڵدا دەکات. بەڵام هەرکوردێ خۆش باوەڕە و بە سوێند و سۆزی عەجەم فریویی خواردووە و باوەڕی پێ هێناوەن کەچی تائێستاش بە درێژایی مێژوو، کەس نەیدیوە، تاکو جارێکیش عەجەم بە سوێند و وادە و ئەو پەیمانانەی کە بەسەرانی کوردی داون، وەفای پێ بکاو وادەکانی دەگەڵ کورد بەجێ بگەیەنێ. هەر هەموویان درۆو فڕو فێڵ بووە. جاوا من وەکو برایەکی بچووکی ئێوە، لە رێگای خوادا، بۆخاتری خودا پێتان دەڵێم؛ یەکتر بگرن و قەت پشتی یەکتر بەرمەدەن، دڵنیابن ئەگەر عەجەم هەنگوینتان بداتێ، دیارە ژەهری تێکردووە، بە کوڵیەو فریو مەخۆن، کە ئەگەر هەزار جار دەست لە قورئانی پیرۆزیش بداو بەڵێنتان پێ بدا؛ دڵنیابن تەنیا مەبەستی فریودانی ئێوەیە، تاوەکو فێڵێکتان لێ بکا.

وا من لە دوایین ساتەکانی ژیانمدا بۆ خاتری خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکەم، پێتان دەڵێم و خوا بۆ خۆی دەزانێ کە من ئەوەی لە دەستم هات؛ بە سەرو بەگیان و تێکۆشان، بە ئامۆژگاری و رێنوێنی و نیشاندانی رێگەی راست ئێوە درێغیم

نەکردووە، ئێستاش لەو ساتەدا لەو بارودۆخەدا؛ دیسان پێتان رادەگەیەنم کە چیتر فریوی عەجەم نەخۆن و باوەڕ بە سوێندو دەست لە قورئان دان و بەڵێن و سۆزەکانیان مەکەن، چونکە عەجەم نەخوا دەناسن و نەباوەڕیان بە خواو پێغەمبەر هەیەو نە باوەڕیان بە رۆژی قیامەت و حیساب و کتاب هەیە، لەلای ئەوان ئێوەن، هەر لەبەر ئەوەی کە کوردن با موسڵمانیش بن، تاوانبار و محکوومن، بۆ وان دووژمنن، سەروماڵ و گیانتان بۆ ئەوان حەڵاڵە و بە غەزای دەزانن، بەڵێنم وانەبوو من برۆم و ئێوە بەدەست ئەو دوژمن دڵڕەشانەوە بەجێ بهێڵم. زۆرجاریش بیرم لە رابردوو گەورە پیاوانمان کردۆتەوە؛ کە عەجەم بەفریوو سوێند و درۆ و حیلە گرتوویانن و کەشتوویانن، چونکە لە مەیدانی نەبەردیدا دەرووەشیان نەهاتوون و نەیانتوانیوە لە بەرامبەریاندا بوەستن؛ ناچار بەدرۆو فرو فێڵ هەڵیان خەڵەتاندوون، کوشتوویانن.

من ئەوانم هەر هەموویان لە بیربوو، قەتیش باوەڕم بە عەجەمان نەکردووە، بەڵام عەجەم لەپاش گەڕانەوەیان بۆ ئێرە چەندین جار وەڵام و راسپاردەیان بە نامە و ناردنی کەسی ناوداری کورد و فارس بەدانی بەڵێن و پەیمانی یەکجار زۆر و بۆ کە دەوڵەتی عەجەم و شا خۆی نییەتی خێریان هەیە و ئامادەنین تەنانەت دڵۆپێک خوێن لە کوردستان برژێ.

ئێستا ئێوە ئەنجامی بەڵێنەکانیان بەچاوی خۆتان دەبینن، ئەگەر سەردانی هۆز و عەشیرەتە کوردەکانمان خیانەتیان نەکردبا و خۆیان بە حکوومەتی عەجەم نەفرۆشتبا؛ ئێمە و ئێوە و کۆمارە کەمان، وای بەسەر نەدەهات.

ئامۆژگاری و وەسیەتم ئەوەیە: بامنداڵەکانتان بخوێنن، چونکە ئێمەی میللەتی کورد بۆ ئەوەی لە کاروانی گەلان دوانەکەوین، هەر خوێندن چەکی کوشندەی دوژمنە-

دڵنیابن و بزانن ئەگەر تەبایی و یەککگرتن و خوێندەواریتان باش بێ؛ زۆر باشیش بەسەر دوژمنانتدا سەردەکەون. ئێوە نابێ بە کوشتنی من و براو ئامۆزاکانم چاوتان بترسێ. هێشتا دەبێ زۆر کەسی دیکەی وەکوئێمە لەو ڕێگایەدا گیان بەخت بکەن. تادەگەنە ئاوات و مەبەستتان.

دڵنیام لە دوای ئێمەش زۆر کەسی دیکە هەر بەفێڵ و دووڕوویی لەبەرین دەبڕین. دڵنیام زۆر لەوانەی لەدوای ئێمەش دەکەونە دوای فڕو فێڵی عەجەمان؛ لە ئێمەش زیاتر و لێهاتووتردەبن، بەڵام هیوادارم کوشتنی ئێمە ببێتە پەند و عیبرەت بۆ دڵسۆزانی گەلی کورد. هەر چییەکتان بۆ سەرفرازیی ئەو گەلە کرد، کۆمەکتان لە ئەو بۆ بێ؛ دڵنیام خوای گەورە سەرتان دەخا و کۆمەکتان دەکا. ڕەنگە بڵێن ئەی بۆ من سەرنەکەوتم؟ لە وەڵامدا دەڵێم؛ بەو خوایە من سەرکەوتووم. چ نیعمەتێک و چ سەرکەوتنێک لەوە گەورەترە کە ئێستاوا من لە ڕێگەی گەل و میللەت و وڵاتەکەمدا، سەر و ماڵ و گیانم لەپێناو ئەودا دادەنێم. باوەڕ بکەن؛ من خۆم لە دڵمەوە ئارەزووم بوو؛ ئەگەرمردم، بەمەرگێک بمرم کە لە حزووری خواو ڕەسولی خواو گەل و میللەتەکەمدا؛ ڕووسووربم بۆ من ئەو مەرگە سەرکەوتنە. خۆشەویستەکانم - کوردستان ماڵی هەموو کوردێکە. هەر وەکو لە ماڵەوەدا ئەندامانی ئەو ماڵە هەرکەس لە هەر جۆرەکار و کردەوەیەکدا دەیزانێ، ئەوکارەی پێ

دەسپێرن؛ ئیتر کەس مافی چاوچنۆکی پێ نییە، کوردستانیش هەر ئەوماڵەیە؛ ئەگەر زانیتان کەسێک لە ئەندامانی ئەو ماڵەکارێکی لە دەست دێ، لێی گەڕێن با بیکا- ئیتر نابێ بەرد بخەنە سەرڕێی و نابێ بەوە دڵگیربن کە یەکێک لە ئێوە بەرپرسیاریەتیی گەورەی بە دەستەوەیە. ئەگەر کاری گەورە کەوتۆتە سەرشانی کەسێک و بەرێوەی دەبا؛ دیارە لێی دەزانێ و بەرپرسیایەتیی گەورەتریش لەبەرامبەر ئەو ئەگەردهەیە.؟ دڵنیابە برا کوردەکەت هەر چاکترە؛ دوژمن کینەی لە دڵە و ئەگەر من بەرپرسیایەتیی گەورەم لە سەرشانی نەبوایە؛ ئێستا لە ژێرداری سێدارەدا رانەدەوەستام.

بۆیە نابێ دەگەڵ یەکتردا چاو چنۆک بن، ئەوانەی فەرمانی ئێمەیان بەجێ نەدەگەیاند؛ نەک هەر فەرمانی جێبەجێ نەکردن؛ بەڵکو بەتەواوی دوژمنایەتیان دەکردین. لەبەر ئەوەی خۆمان بە خزمەتکاری خەڵکی خۆمان دەزانی.

ئێستا ئەوان لەنێوماڵ و منداڵی خۆیان لە شیرن خەودان. بەڵام ئێمەبە ناوی خزمەت کردن بە میللەت؛ وا لەژێر داری سێدارەین و خەریکم دوایین ساتەکانی ژیانم، بەم وەسیەتەنامەیە تەواودەکەم؛ ئێستا منیش وەک ئێوە لە ناو خاو و خێزان و لە ماڵی خۆم لە شیرن خەودا دەبووم، ئەوەی کە ئامۆژگاریتان بۆ دوای خۆم دەکەم. ئەمەش یەکێکە لەو بەرپرساریەتیانەی کە لە سەرشانمە، دڵنیام ئەگەر کەسێکی دیکە لە ئێوە؛ بەرپرسیاریەتییەکانی منی وە ئەستۆی خۆی گرتبا، ئێستا ئەو لە شوێنی من لە ژێر سێدارە دەبوو وامن بەمەبەستی رازایەتیی خودا و بەپێیی بەرپرسیارەتیی سەرشانم؛ وەکو کوردێکی خزمەتکاری گەل و لە رێگای کاری

چاکدا (امر بالمعروف) ئەو چەند ئامۆژگارییەم کردن کە هیوادارم لەمەودوا عیبرەت وەربگرن، و بە تەواوی گوێ لە ئامۆژگارییەکانم بگرن، بە هیوای خوادا بەسەر دوژمنتاندا سەرکەون.

١- باوەڕتان بە خودا و (ما جاء من عند الله) و پەرستنی خوداو پێغەمبەر(د.خ) و بە جێگەیاندنی ئەرکی ئایینی پتەو بێ.

٢- یەکێتی و تەبایی لە نێوان خۆتاندا بپارێزن، کاری نەشیاو لەبەرامبەر یەکتردا مەکەن و چاوچنۆک مەبن بە تایبەت لەبەرپرسیاریەتی و خزمەتکردن دا.

٣- خوێندن و زانست و پلەی زانیاریتان بەرنەسەرەو؛ بۆ ئەوەی کەمتر فریوی دوژمنان بخۆن.

٤- باوەڕ بە دووژمنان مەکەن، بەتایبەت بە دوژمنی عەجەم، چونکە بەچەند هۆو ڕێگاوە عەجەم دوژمنی ئێوەیە، دوژمنی گەل و نیشتیمان و ئایینتانە. مێژوو سەلماندوویەتی کە بەردەوام لە کورد بەبەهانەیەو لەسەر کەمترین تاوان دەتانکوژێ و لە هیچ تاوانێک بەرامبەر بە کورد دەست ناگێڕێتەوە.

٥- بۆ چەند ڕۆژێک ژیانی بێ قیمەتی ئەم دنیایە خۆتان بە دوژمن مەفرۆشن، چونکە دوژمنە؛ دوژمن جێگەی هیچ باوەڕ پێکردنێک نییە.

٦- خیانەت بەیەکتری مەکەن، نەخیانەتی سیاسی و نەگیانی و نەماڵی و نامووسی، چونکە خیانەتکاری لای خودا و مرۆڤ سووک و تاوانبارە؛ خیانەت بە ڕووی خیانەتکاردا دەگەڕێتەوە.

٧- ئەگەر یەکێک لە ئێوە توانی کارەکانی ئێوە بەبێ خیانەتکردن ئەنجام بدا، هاوکاری بکەن، نەوەک لەبەر چاوچنۆکی و بەخیلی

دژی بوەستن. یا خوانە خواستە لەسەری ببن بە جاسووسی بێگانە.

٨- ئەو شۆێنانەی لەوەسیەتنامەکەدا نووسیومە بۆ مزگەوت و نەخۆشخانە و قوتابخانە ئێوە هەمووتان داوای بکەن تا دەکرێ و سوودیان لێ وەرگیرێ.

٩- ئێوە لە خەبات و هەوڵ و تێکۆشان مەوەستن؛ تاوەک هەمووگەلانی دیکە لەژێر چەپۆکی دوژمنان رزگارتان دەبێ، ئەگەر ولاتێکتان هەبێ، سەربەستیەکو هەبێ، ماڵ و خاک و نیشتمانە کەو هی خۆتان بێ، ئەو کاتە هەمووشتێکتان هەیە، هەم ماڵ، هەم سەروەت، هەم دەوڵەت و ئابڕووی نیشتمانتان دەبێ.

١٠- من بێجگە لە خودا قەرزاباری کەس نیم - بەڵام ئەگەر کەسێک لای وابوو کە لەکەم تا زوو شتێکی لای منە، سەروەتی زۆرم بەجێ هێشتووە وەری بگرێتەوە تا ئێوە یەکنەگرن، سەرناکەون، زوڵم زۆر لەیەک مەکەن، چونکە خوا زۆر زوو زوڵم لەبەین دەبا و نابوودی دەکا، ئەوە بەڵێنی خواوەندە بێ کەموزیاد؛ زاڵم دەڕووخێ و نابوود دەبێ، خوا تۆڵەی زوڵمی لێدەکاتەوە.

هیوادارم ئەو شتانە لە گوێ بگرن خوا سەرکەوتووتانکا بە سەردوژمناندا وەک سەعدی دەفەرموێ؛

مرادما نصیحت بود و کفتیم<br>
حوالت با خداکردیم و رفتیم

**خزمەتگوزاری گەل و نیشتمان**

**قازی محەممەد**

قازی محەممەد پاش نووسینی وەسیەتنامەکە؛ دوورکات نوێژ دەکا و بەسەرهەنگ و ئەوانەی لەوێن دەڵێ: لەبەر ئەوەی لەشەرعی ئیسلامدا لەسێدارەدانی موسڵمان کارێکی ناپەسندە؛ تیرەبارانم کەن. بەڵام مەئموورەکان دەڵێن؛ حوکمی ئیعدامتان بە سێدارەیەو رەتکردنەوەی بۆ نییە. ئیدی دەیهێننە ژێرداری سێدارە. قازی محەممەد لە دوایین کات و ساتەکانی ژیانیشیدا هەروا سوور بوو لەسەر ئیمانی بە ئازادی و رەوایی مافی میللەتی کورد و بە سەرهەنگ و مەئموورەکان دەڵێ: ئێوە ئێستا قازی محەممەدێک ئیعدام دەکەن، بەڵام سبەینێ لەهەر دڵۆپە خوێنێکم هەزاران قازی محەممەد سەر هەڵدەبڕن و رێگای من درێژەپێ دەدەن"

بەو جۆرە بوو پێشەوا قازی محەممەد، سەر لە بەیانیێ؟ رۆژی دوشەممە ١٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٦،ی.ە گیانی پاکی خۆی لە پێناو ئازادی و دیفاع لە نەتەوەی کورد؛ دا بەخت کرد. پاش بە رێوە چوونی حوکمی زاڵمانەی لە سێدارەدانی قازی محەممەد؛ حەمەحوسین خانی سەیفی قازییان هێنایە بەردەم سێدارە و پاش بە رێوەبردنی رێوە رەسمی وەسیەتنامە نووسین بە قەڵەمی خۆی؛ بۆ ئیعدام کردن دەیهێننە گۆڕەپانی چوارچرا. ژەنەڕاڵ حەمە حوسێن خان بە دیتنی تەرمی پاکی پێشەوا قازی محەممەد هاواردەکات و "بژی پێشەوای مەزنی کوردستان" بژی نەتەوەی کورد. هاواری حەمەحوسێن خان هەموو خەڵکی دەوروبەری گۆڕەپانەکە لە خەو هەڵدەستێنێ و سەرەڕای ئەو هەموو هەڕەشەیە، دێنە بەرپەنجەرەکانی. نەعرەتەی دەنگی سەیفی قازی گۆڕەپان و دڵی ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی کۆڵان و سەربانی

مالآنیان گرتبوو؛ خستەلەرزە. کاتێ کورسییەکەی ژێرپێی حەمەحوسێن خان لادەبەن، پەتی سێدارە خۆ لە بەر قورسایی لەش بەهێزی ناگرێ و دەپسێ. دەمودەست هەڵیدەگرن و دەیبەنە ژێر سێهەمین دار کە بۆ سەدری قازی ئامادەکرابوو؛ ئەویش شەهید دەکەن. بۆ سێهەمین جار و لە روناکیی بەیانیدا ئەوبولقاسمی سەدری قازی نوێنەری خەڵکی مەهاباد لە خولی چواردەهەمی پەرلەمان. هەر بەو شێوەیە دێننە گۆڕەپانی چوارچرا و پاش خوێندنەوەی حوکمی ئیعدام، سەدری قازی وەسیەتنامەکەی دەنووسێ و راسپاردەکانی خۆی سەربارەت بەملک و ماڵ و دارایی خۆی رادەگەیەنێ و ئەوسا دەیبەنە پای سێدارە و بڕیارەکەی لەسەر جێ بەجێ دەکرێت.

## درێژەی رێگەی شەهیدان

لەسەروبەندی دادگایی کردنی قازییەکاندا؛ دادگایەکی رواڵەتیش لەسەقز لەئارادبوو. ئەو دادگا رواڵەتیەش بەرێزان؛ کاک ئەحمەدخانی فاروقی، عولاخانی مەتین؛ حەمەخانی دانیشوەر، حەسن خانی فەیزوڵلا بەگی؛ (قەلەندەر) ئەحمد خانی شەجیعی فەیزوڵلا بەگی (کەڵتەگە) و عەلی جەوانمەردی) رەسول جەوانمەردی، شێخ سەدیقی جەوانمەردی و شێخ حەمەدەمینی ئەسعەدیی بە ئیعدام مەحکوم کرد.

هاوکات لە شاری بۆکانیش عەلی بەگی شێرزاد نوێنەری هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە دادگایەکی نیزامی و نهێنیدا حوکمی سێدارەی درا. رۆژی ١٣٢٥/٢٥ی.ە/١٩٤٦ی.ز یازدەکەس لەم

ئازادیخوازانە لە شاری سەقز و عەلی بەگی شێرزاد لەسێدارەدران و شەهیدبوون. لەشاری سەقز پێنج خاڵۆزا و دووخزمی دایک و عەلی بەگی شێرزاد خاڵۆزای قازی محەممەد رەگەڵ کەوتن. حەوتوویەک پاش ئیعدامی قازییەکان چوار ئەفسەری کوردیش کە لە بەندیخانەی تەوریزبوون لە بە ناو دادگایەکی نیوامیدا بە ئیعدام مەحکووم کران و سەر لە بەیانیی دووشەممە ١٩٤٧/١٣٢٦/١٧ی.ز لە گۆڕەپانی چوارچرا لەسێدارەدران کە ناوکانیان بریتی بوون لە؛ حەمیدی مازووچی، رەسول نەمەدەیی، عەولای رۆشەنفکر و مخەممەدی نازمی.

## "پرسەی میللی"

خەڵکی شاری مەهاباد، پاش ئەوەی خۆر لە ئاسماندا لەنگەری گرت و هاتوچۆکردن ئازاد بوو؛ لە ماڵ دێنە دەرێ و ئاگاداریی شەهیدکردنی قازییەکان دەبن. شاری مەهاباد، یەکسەر بەرگی شین و ماتەم دەپۆشێ بە چەشنێک کە قەڵەم لە شەرحی ئەم کارەساتە دڵبرژێنە کۆڵە.

دوای بیستنی ئەم هەواڵە تاڵە، چوومە ماڵی شەهید قازی محەممەد، وەک رۆژی حەشر وابوو. دەگەڵ چەند کەسێک چووینە گۆڕەپانی چوارچرا. سەربازە چەکدارەکان کە بەریز وێستابوون، پێشیان پێ گرتین. دایکم و ژنانی بنەماڵەی قازی محەممەدیان گەڕاندەوە. بەڵام سەرگوردنەوایی پارێزەری سەدری قازی، کە دەیناسم سەربازەکانی لاداو دەستی منی گرت و بردمیە بەردارەکان. من خۆم، وەک مردووانم لێ هاتبوو. ئەو دیمەنە زۆر نارەحەتی کردم، حەولمدا بەسەر خۆمدا زاڵبم و بە

بەرپرسیارێتییەوە دەگەڵ چارەنووسی نەتەوەکەم رووبەڕووببمەوە لەو ساتەدا کە چەند کەسێک جەنازەی شەهیدەکانیان دادەبەزاند.

سەرهەنگ پارسی تەبار، بە قەڵافەتێکی دزێوو تووڕەوە وەک میرغەزەب بەرەو سێدارەکان و وێستابوو و هێندێ شتی دەگوتن کە من واتێکچووبووم نەمدەزانی دەڵێ چی؟ پەیکەری پاکی شەهیدان پاش دابەزاندنیان بۆ شوشتن وکفن کردنی بردران بۆ مزگەوتی حاجی ئەحمەد رووبەڕووی شارەبانی. لە گەمارۆی فەوجێک سەرباز لە ژێر چاوەڕوانیی سەروانێکدا و دەگەڵ ئەوانەی تەرمەکانیان لەسەر شان بوو، بەرەو مزگەوتی حاجی ئەحمد رۆیشتن و خەڵات کردنی تەرمی پاکیان، هەرسێک شەهیدەکانمان بەرەو گۆڕستانی شاربرد. ئەوکات هەر لە سەرەتای شەقامی (جامی جەم)ی ئێستاوە، لە گۆڕەپانی مەلاجامییەوە هەتا کۆتایی شەقامەکە؛ هەر گۆڕستانی مەلاجامی بوو. بینای کۆنی فەرمانداری مەهابادیش گۆشەی باشووریی چیمەنی گۆڕەپانەکەی مەلاجامییەوە هەڵکەوتبوو و باقیی مەیدانەکە دارستان بوو. وەک ئێستا نە بوو. من و هاوڕێیان تەرمی شەهیدە سەربەرزەکانمان. لە شوێنی ئێستەی فرۆشگای فەرهەنگیانەوە، بردە نێو گۆڕستانەکە. لەوێ دیمەنێکی وام بینی کە هیچکات فەرامۆش ناکام. خەڵکی شاری مەهاباد بە تایبەتی ژنان، منداڵ و مێرمنداڵ کە لەوکارەساتە دڵتەزێنە ئاگادار ببوونەوە بە تێکڕایی بۆ دیتن و بەخاک ئەسپاردنی تەرمی شەهیدانی کوردستان، رژابوونە گۆڕستانەکەوە. بێ زێدەڕۆیی ٨٠%ی خەڵکی مەهاباد هاتبوون و بەشی هەرە زۆری گۆڕستانەکە بەتایبەت شوێنی قەبری شەهیدەکانیان داگرتبوو. هەتا چاو بڕی دەکرد شەپۆلی خەڵک لە ژن

و منداڵ و پیرو لاو دەدیتران. هەر ئەوەندەی تابووتەکان وەدەرکەوتن ئەم دەریای جەماوەرە یەکسەر لە بانگی دا. دەتکوت ڕۆژی حشرە. من بەدیتنی ئەو دیمەنە سامناکە و بیستنی ئەم درۆشمە میللی و نیشتمانییانەی خەڵکی شاری؛ زیاتر وەخۆ هاتمەوە و تازە زانیم خوێنی شەهیدان هەنگاوی خەڵک و ورەی جەماوەری پتەوترکردووە. بەراستی ناتوانم، ئەو هەمووە ئازایەتی و کەفو کوڵە نەتەوەییە شەرح بکەم. سەربازەکان کە بەدیتنی دەریای بەلرفەی ئەو خەڵکە زەندەقیان چوو بوو، ئامادەی تەقەکردن بوون و خەڵکیان دەکشاندەوە. بەڵام هێندێک لە ژنان وا هەڵچووبوون، وەک شێری شەرزە شاڵاویان بۆ سەربازەکاندەبرد. ئاخیری هەر ئاڵقەی گەمارۆی سەربازانبان شکاندو خۆیان گەیاندە تابووتەکان و خۆڵ و خاکی گۆڕستانەکەیان وەسەرخۆیان کرد. ئەوان بە دروشمی توند شای خەیانەتکار- بەکرێگیراوە گوێ لەمستەکانی شایان جنێوباران کردو شان بەشانی تابووتەکان تاسەر قەبرەکان هاتن. سەرباز بە هیچ کلوجێ[1] نەیانتوانی پێشیان پێ بگرن. فەوجێکی دیکەشیان سەرباز هێنایە گۆڕستانەکە و بەزەبری سەرنێزەو تەقە کردن خەڵکیان سەر مەترێک لە گۆڕەکان دوورخستەوە هەتا پەیکەری پاکی شەهیدانیان بە خاکی پیرۆزی گۆڕستان ئەسپارد. سەرباز وردەوردە گۆڕستانیان بەجێ هێشت و بە شەپۆ رووگریانەوە هاتنە زیارەتی قەبرەکانی و باوەشیان دەکێلەکانیان وەراند و بەڵێنیان بەقارەمانانی نیشتمان دا کە هەتا دوایین ساتی ژیان درێژە بەرێگەی پڕ لە شانازییان بدەن و پاش چەند سەعات شین و ڕۆ؛ بەهۆی

(١) بە کلۆجێ: بە هیچ جۆرێک

هێرشی سەرلەنوێی سەربازەکان؛ خەڵکی قارەمانی مەهاباد، ناچارکران بگەڕێنەوە ماڵەکانیان.

کارەساتی لەسێدارەدانی قازییەکان؛ لە بڵاوکراوەکانی ئێراندا بە فەرمانی ستادی ئەرتەش؛ بەشێوەی چەوا شەکارانەو زۆر نامرۆڤانە بڵاوکرایەوەو خەڵکی ئێرانی لێ ئاگادار کرایەوە.

**راگەیەندراو**

ستاری هێزی ئەرتەش: رەزائیە

روکنی دوو: رێکەوتی ٢٦/١/١٠

ژمارە ١٩١٢٥

سەعات -٨-

لە کۆتایی ساڵی ١٣٢٠ەوە محەممەد قازی (قازی محەممەد)- ئەبولقاسمی سەدری قازی و حەمەحوسێن سەیفی قازی؛ بەردەوام کەوتنە ورووژاندنی خەڵک و تێکدانی هێمن و ئاسایشی ناوچە وردە وردە کردەوە جەنایەتکارانەکەی خۆیان پەرەپێدا کە بووە هۆی روودانی هێندێ کارەساتی دڵتەزێنی وەک؛ هێرش کردنەسەر شارەوانیی مەهاباد و کوژرانی ٥ پاسەوان، تاڵانکردنی شارەوانی و فەوتاندنی بەڵگە و شوێنەواری جەنایەتەکانیان، کوژرانی موەحموودیان بازرگانی مەهابادی؛ قازی زادەی بەرپرسی ئامار؛ کە هەمووان بوونە قوربانیی تەماح و زێدەخوازیی ئەوان. هەروەها تاڵانی دێهاتەکان و کارەساتە گەلێکی دیکە لە ناوچەدا. قازی محەممەد بە هاوەدەستیی براکەی خۆی سەدری قازی کە بەڕواڵەت نوێنەری مەهاباد بوو، بەڵام لە راستیدا گەلاڵە داڕێژەری هەموو نەخشە دزێوەکانی دابڕینی بەشێک لە ئێران بوو؛ دەگەڵ سەیفی

قازی؛ بۆ وە دیهێنانی ویستە چەپەڵەکانیان، تەواوی بەرپرسانی ئیدارە دەوڵەتییەکانیان لە مەهاباد وەدەرنا و لە رۆژی ٢٤ی سەرماوەزەوە ئاڵای سێ رەنگی شێر و خۆرشیدی ئێرانیان لەسەربینای دەوڵەتی هێنایە خوار و ئاڵایەکیان بە ناوی ئاڵای کوردستان هەڵکرد. رۆژی ٢ی رێبەندانی ٢٤ محەممەد قازی، خۆی وەک سەرکۆماری‌کوردستان ناساند و ژمارەیەک لەخەیانەتکاران و[1] "پاشەڵ پیس" کە هاوکاری بوون بەمەبەستی پراتیک کردنی ویستەکانی خۆی، وەک وەزیرانی دەوڵەتی خودموختار هەڵیبژاردن. و بۆ بەرەنگاریی هێزەکانی دەوڵەت؛ تاقمگە لێکی چەکداری لە مەهابادیان و بارزانیان پێک هێناو ژمارەیەکی زۆر چەکو چۆڵی لە نێو خەڵکی ئاسایی و عەشیرەتاندا بڵاوکردەوە و ناردنی بەری سەقز و سەردەشت و لە ئاکامدا، کارەساتگەڵێکی خوێناوییان لێکەوتەوە. گەرچی هێزی کوردستان (ئەرتەش وەرگێڕا- چەند جاران داوای لێکردن سەربەردەنەوە و وانەکەن؛ بەڵام بێ فایدەبوو، هەروەها لە تارانیش گەورە بەرپرسانی دەوڵەت حەولیاندا لەو کردەوە ناحەزانەیان بگێڕنەوە: کەڵکی نەبوو. هەر ئەو رێگەیان گرتەبەر، لە نێوەڕاستی سەرماوەزی ٢٥دا کاتی رۆشتنی هێزی کوردستان بەرەو ئازەربایجانە؛ ئەوانە لە کۆبوونەوە و مزگەوتاندا خەڵک و عەشیرەتەکانیان بۆ بەربەرەکانێ هێزەکان هان دەدا بەنووسراوە فەرمانی هێرش بۆ سەرهێزە نیزامییەکانیان دەرکرد. بەڵام بەختەوەرانە ئەوانە لێیان تێگەیشتن و بە قسەیان نەکردن. نیزامییەکان بە خێرایی پێشرەوییان کرد و تەواوی گەلاڵە

---

(١) کەسێک کە رابردووی خراپ بێ.

خەیانەتکارەکاکانیان هەڵوەشانەوە. دەرەنجام ئەوەی کە؛ ئەو خەیانەتکارانە گیران و درانە دەستی عەدالەت. پەروەندەکانیشان دران بە داگای نیزامیی سەردەمی شەڕو هەرسێکیان بەئیعدام مەحکووم کران- دادگای دووبارەپێدا چوونەوەش بڕیارەکەی پەسەندکردو دواجار لەلایەن ئێمەی خزمەتکاری شای خاوەن شکۆوە پەسند کراو سەعات ٦ی رۆژی ١٠ی خاکە لێوە لە مەهاباد بە رێوەچوو. فەرماندەی لەشکەری ٤ و هێزی کوردستان – سەرلەشکەر هومایونی.

### قازی محەممەد هێما و ئوستوورەی نەتەوەیی کورد

بەڕێوەچوونی بڕیاری سێدارە، نەتەنیا تۆسقاڵێکی لە پلە و خۆشەویستیی قازی محەممەد، سەدری قازی و سەیفی قازیی کەم نەکردەوە، بەڵکو ئەم کردەوە نامرۆڤانەیەی دەوڵەت و ئەرتەشی شا، بووە هۆی ئەوەیکە لە نێو نەتەوەی کورد و بزووتنەوە رزگاریخوازییەکانی ناوخۆ و دەرەوەی ئێرانیشدا، خۆشەویستتر بن. بەڕاستی ئێستاکەش بیرۆکە و ئەندێشە سیاسیی و ئینسانییەکانیان لە باری ئیستراتژیکی و زانستییەوە؛ هەروا سەرمەشقی رۆشنبیران، لاوان و خوێندکارانی کوردن و ئاکارە کۆمەڵایەتی و داوەرییەشەرعی و یاساییەکانی قازی محەممەد، نموونەیەکی جێی متمانەن بۆ توێژە جۆرا و جۆرەکانی خەڵکی کوردستان.

گەڕیدەکان، نووسەران و شاعیرانی ئێرانی و بیانی، گەلێک کتێب و وتار و توێژینەوەی جۆراوجۆر یان لەبواری یەکەمین

بزووتنەوەی پێشکەوتخوازانەی کورد، داخوازیی مێژوویی کوردو پڕەنیسپ و بنەما فکرییەکانی قازی محەممەد دا نووسیوە و لێی دواون. قازی محەممەد بۆ یەکەمین جار بزووتنەوەی نەتەوەی کوردی لە سیستەمی خێڵەکییەوە دەرهێناو بەشێوەیەکی حیزبی و ڕێکخستنی مۆدێڕن دابڕشت- هەرکام لە بەیت بێژو گۆرانی بێژو هونەرمەندانی کورد لەڕوانگەی خۆیانەوە؛ ئازایەتیی و حەماسەی خۆڕاگریی قازی محەممەد و هاوڕێکانییان وتووەتەوە. قەبری قازییەکان بۆەتە زیارەتگە رووگەی هەموو کوردێک. بە کورتی؛ قازی محەممەد هێما و ئوستوورەی ئازادی، دیموکراسی و رەمزی خۆڕاگریی و سەرهەڵدانی جەماوەریی نێو خەڵکی‌کوردە- ئەو دەراوی خەبات و خۆڕاگریی بۆ تۆرەمەی داهاتوو خۆش کرد. واتە لە هەرشوێنێ باسی ئازادی و دیاریکردنی مافی چارەنووس؛ کۆمەڵگەی مەدەنی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بێتە گۆڕێ؛ ناوی ئەو زاتەبەرزە بەسەر بزووتنەوە رزگاریدەرە نەتەوەییەکانەوە دەدرەوشێتەوە.

## چاوخشاندنەوەیەك بەسەر هەلومەرج و بارودۆخی کۆمەڵایەتیدا

لە دامەزرانی کۆمەڵەی (ژ.ک) ەوە هەتا گۆڕینی ئەم ناوە بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان و دامەزراندنی کۆماری کوردستان؛ قازی محەممەد، سەرەڕای ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرە نێوەکی و دەرەکییانە و بەربەرەکانێ لە بەرامبەر دوژمنانی ئازادی و دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەی کورد؛ وتووێژی قورس و دوورودرێژ دەگەڵ بەرپرسانی ئازەربایجان و دەوڵەتی ناوەند و

بارودۆخی لە شەڕو ئاشتی لە دەوڵەت و سوپا شا؛ بەو پەڕی لێزانی و خۆڕاگرییەوە رێبەرایەتیی ئیدارەی کوردستانی کرد. بەهۆی ئەو چالاکی یە کۆمەڵایەتییە بەنرخانەوە بوو کە هەم لە سەردەمی رەزاخان و هەم باش رووخانی ئەو لە خەرمانانی ١٣٢٠ی.ه- ١٩٤١ی.ز دا و پاش هێرشی هاوپەیمانان و پێکهاتنی بۆشایی دەسەلات لە ناوچەی موکریان دا: ئەرکی گرانی رێبەرایەتی کەوتە ئەستۆی قازی محەممەد.

قازی محەممەد سەرەڕای ئەو پەیوەندییانەی جاروبار دەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران پێکی دێنان وتووێژی دەگەڵ بەرپرسانی سۆڤیەت دەکرد، دەیویست لە هێز و دەسەلاتی دەوڵەتەکانی بەریتانیا و ئەمریکاش بە قازانجی نەتەوەی کورد کەلک وەرگرێ و لەو رێگەیەدا گەلێک ههولێدا، بەلام بەداخەوە بەریتانیاییەکان هیچ حەزیان لە ئازادیی نەتەوەی کورد نەبوو ئەمریکاییەکانیش لەکاروباری رۆژهەلاتی نێوەڕاست دا، تازەکارو بێ ئەزموون بوون و ببوونە کلکی سیاسەتی بەریتانیا و ئەم دوو ولاتەش بەرژەوەندییەکانی خۆتان لە پشتیوانی کردن لە دەولەتی شادا دەبینی و بە چاوێکی جیاواز لە ئازەربایجانیش لە کوردستانیان دەڕوانی. هاموشۆی کاربەدەستانی سوڤیەت زەمینەیەکی فیکریی نالەباریان لە بیر و زەینی بەریتانیایی و ئەمریکییەکان دا خولقاندبوو قازی محەممەد، مەرجی رزگاریی ئەم نەتەوەیەی لەوەدا دەبینی کە دۆست و لایەنگری وا بۆ کورد پەیدابکا کە بەباشی دەرکیان بکا.هەربۆیەش ناچاربوو، بەمەبەستی دۆستایەتی دەستی بۆ درێژ کردبوون. بەرواڵەت شورەوییەکان،

زیاتر لە هەموان خوازیاری دۆستایەتی و هاوکاری دەگەڵ نەتەوەی کوردبوون و ئاوڕیان لە کوردەکان دەدایەوە. تێکۆشەرانی ڕێگەی ئازادی و رزگاریی نەتەوەی کوردیش، ناچاربوون بە باوەشی ئاوەڵاوە وەریانگرن و لە پێناو گەیشتن بە ئامانج و ویستەکانیاندا، کەڵک لە هاوکاریی سۆڤیەتییەکان وەگرن. بەڵام دۆست و دوژمن ئاگادارن لەوەیەی سۆڤیەتییەکان لە یارمەتیداندا، جیاوازییەکی زۆریان لە نێوان کورد و ئازەری دادەکرد. حکوومەتی ئازەربایجان تەواو گوێ لەمستی سۆڤیەت و لە راستیدا کلکی سیاسەتی ئەوان بوو. بەڵام کاربەدەستانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا کە لە سەردەمی حکوومەتی کوردستاندا هاتبوونە مەهاباد و چاویان بە خەڵک کەوتبوو دانیان بەوە داناوە کە لە کوردستاندا هیچ باسێک لە کۆمۆنیزم و لایەنگری لە سۆڤیەتییەکان لە گۆڕێ دا نەبوو. خەڵکی کوردستانیش بە ڕەفتاری دیموکراتیانە و بیروباوەڕی ئاوەڵاوە، دەگەڵ رۆژهەڵات و رۆژئاوا رووبەڕووبوونەتەوە.

با نەیشارینەوە کە دەوڵەتی سۆڤیەت گەرچی خۆی بە دۆست پشتیوانی کورد دەزانی، بەڵام بەکردەوە یارمەتییەکی ئەوتۆی پێ نەکردن، ئەم وادە و بەڵێنیانەی سەربارەت بەیارمەتیی ماڵی و چەکو تەقەمەنی بە کورد دابوون، شتێکی وانەبوون لە حاڵێکدا ئازەربایجانەکان هەرچی ویستبایان بۆیان دابین دەکردن.

پێشەوا قازی محەممەد، هیچ کات وەک رێبەرانی فیرقەی ئازەربایجان نە جولایەوەو ملی بۆ ویست و بۆچوونەکانی کاربەدەستانی سۆڤیەت نەوی نەکرەکێشا. ئەوانیش هەموو هیواو ئارەزووەکانیان لە بوونی حکوومەتی ئازەربایجان دا دەدی و

هەرکات بیروڕایەکی جیاواز هاتبا گۆڕێ، ئەوان راشکاوانە لایەنگیرییان لە حکوومەتی ئازەربایجان دەکرد. هەر وەک دیتمان لەو ناکۆکییانەی لەسەر بەڕێوە بردنی ئەو شارانەی هەردوو نەتەوەی کورد و ئازەریان تێدابوو: میاندواو - ورمێ - خۆی - سەلماس هاتنەگۆڕێ. ئەوان لایەنگری پشتیوانییان لە بۆ چوونی ئازەرییەکان دەکرد و ئەوەش بووە هۆی ئەوەیکە رێبەرانی حکوومەتی ئازەربایجان کە هاوپەیمانی حکوومەتی کوردستان بوون بە کردەوە و لە وتووێژ دەگەڵ دەوڵەتی شا؛ کوردستانیشیان وەک بەشێک لە ئازەربایجان لە قەڵەم دەدا و هەروەک دیتمان لە دانوستانەکانی پێشەوا قازی دەگەڵ قەوامسەڵتەنەدا، سۆڤیەتیەکان و ئازەربایجاییەکان پێشنیارەکانی قەوامیان بۆ پێکهێنانی پارێزگایەک لە کوردستان: رەدکردەوە.

چونکە ئەوان نەیاندەویست کوردستان لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە، وەک یەکەیەکی سیاسی سەربەخۆ بناسرێ. سەرەڕای سیاسەتی دووڕووییانەی سۆڤیەت و ئاوڕلێ نەدانەوەی دەوڵەتانی بەرتانیا و ئەمریکا لەکێشەی کورد و دژایەتیی راشکاوانەی دەوڵەتی ئێران؛ قازی محەممەد سیاسەتی خۆڕاگریی رەچاو کرد و مافی دیاریکردنی چارەنووس لە رێی خودموختاری لە چوارچێوەی ئێرانی بە تاقانە رێی رزگاریی نەتەوەی کورد لەوەها هەلو مەرجێکدا دەزانی و هەولی بۆ دەدا و لە و وتووێژانەدا کە دەگەڵ بەرپرسانی بڵاقۆ کە نێو خۆیی و دەرەکییەکاندا دەیکردە پێشبینی داهاتوویەکی روونتر و ئاواتی مەزنتری بۆ کوردستان و نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی ئێراندا دەخواست.

## "هۆکارەکانی شکست"

سەبارەت بە هەرەسی حکوومەتەکانی کوردستان و ئازەربایجان دەکرێ ئاماژە بە گەلێک هۆکاری جۆراوجۆر بکەین کە گرینگترین و بەرچاوترینییان ئەوانەن.

١- سیاسەتی دەوڵەتانی بەریتانیا و ئەمریکا وەک دوو وڵاتی سەرکەوتووی زاڵ بە سەر چارەنووسی دەوڵەتانی جیهاندا و هەروەها دژایەتییان دەگەڵ ئازادی و خودموختاریی نەتەوەکانی کورد و ئازەری.

٢- سیاسەتی دووڕوویانەی سۆڤیەت سەبارەت بە ئێران و کوردستان و ئازەربایجان پاش بەستنی پەیمانی هەڵێنجانی نەوتی باکووری ئێران لەلایەن سۆڤیەتەوە.

٣- بێ هێزیی سۆڤیەت لە بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیا بە هۆی تێکچوونی شیرازەی ئابووری یەکەی لە ژێر زەبری گورچو بڕی ئەلمانیا لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا و پێویستیی سۆڤیەت بە وەرگرتنی یارمەتیی ماڵیی ئەمریکا بۆ سڕینەوە و موتۆربە و نووژەن کردنەوەی کاولکارییەکانی شەڕ.

## هۆکارەکانی ناوەکییەکان

١- سەرکوت کردن و زەبروزەنگی سیستەمی سیاسیی ئێران لەسەردەمی پەهلەوی و گوێڕایەڵیی بۆ ئەمریکا و بەریتانیا-

٢- کەم ئەزموونیی کوردەکان و ئازەرییەکان لە بەستێنی خەباتی سیاسی و حزبی و پێکهێنانی حکوومەتی خودموختاردا.

٣- کەمبوونی بەڕێوبەریتی لێزان و پسپۆڕ لە بواری سیاسی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیدا.

٤- نەبوونی کادیری کارامە لە بواری نیزامیی و دەوڵەتی لەو هەلومەرجە دژوارەدا بۆ پەروەردە و راهێنانی نیزامی پێشمەرگە و فیداییەکان.

٥- ئاڵۆزی و بێ سەروبەریی بارودۆخی ئابووریی کوردستان، کەمبوونی سەرچاوەی داهات و ناشارەزایی و تێنەگەیشتن لە پرینسیپەکانی بازرگانیی نێوەدەوڵەتی، دەکارنەکردنی بەرهەمەکانی کشتوکاڵ یا کەڵک وەرگرتن لە کانگاو پیشە ناوچەییەکان کوردستان.

٦- دژایەتیکردنی توندوتیژانەی دەوڵەتە گوێ لەمستەکانی ناوچە دەگەڵ هەرچەشنە بزووتنەوەیەکی ئازاریخواز و پێشکەوتخواز.

٧- هێز و دەسەلاتی هۆزو عەشیرەتان کە زۆربەیان تووشی ناکۆکی نێو خۆیی و زێدەخوازی ببوون و هیچ فرپان بەسەر خەباتی سیاسی و حیزبییەوە نەبوو؛ وەک رابردوویان نۆکەری زێڕوزیو بوون و لە هەر کوێ (بای خۆش) هەڵیکردبا ئەوا شەنیان دەکرد.

٨- پاشەکشەو تێکشکانی چاوەڕوان نەکراوی ئازەربایجان و هەلاتنی ریبەرانی ئەوێ بۆ سۆڤیەت تۆڵەی خەڵک کە بووە هۆی دڕدۆنگی و دوودڵی لە نێو عەشیرەتە کوردەکانیشدا.

٩- ترس لە پێکهاتنی کو شتوکوشتاری نێوخۆیی کە لە لایەن دەوڵەت و سوپا شاوە، بەردەوام دەراوی بۆ خۆش دەکرا.

١٠- ئەم هۆکارانە، دەستیان دایە دەستی یەک و کۆتاییان بەتەمەنی کورتی حکوومەتی کوردستان ئازەربایجان هێنا.

## وەڵامی قازی محەممەد بە نامە بۆسەرۆکی ستادی ئەرتەشی شا

ئەودەمەی سەرلەشکەر رەزم ئارا سەرۆکی ستادی ئەرتەش، لە نامەیەکدا کە لە سەقزەوە بۆ قازی محەممەدی نووسیبوو و بە ئەرتەشی هەڵ گوتبوو کە ئەرتەش بەهێزە و کەس شانی لەشانی نادا قازی محەممەد وێڕای باسکردن لە ئاشتیخوازیی نەتەوەی کورد هەڵاتنی بەرپرسانی سوپا لەبەر هێرشی هاوپەیمانان وە بیرهێنابوونەوە و گوتبووی؛ بەرپرسانی سوپا بە پێچەوانەی ئەوشیعرەی فێردەوسی؛

همه سر بەسر تن به کشتن دهیم
ازڕن بە کە کشور بە شمن دهیم

**گوتیان:**

همه سر به سر پشت به دشمن دهیم
ازڕن به که خودرا به کشتن دهیم.

وەڵامەکەی قازی محەممەد، بەرپرسانی ئەرتەش و خودی حەمەڕەزای پەهلەویی تەواو تووڕەکردبوو.

## بۆ چوونەکان

ئەو کەسانەی ئەو کات هاتوونەتە کوردستان و چاویان بەقازی محەممەد کەوتووە؛ سەرەڕای ئەو تێبینیی‌یە سیاسییانەی کە هەیانبووە، سەربارەت بە کەسایەتی و سەداقەتی ئەو، بۆ چوونی خۆیان دەربڕیووە بۆ وێنە ئارچی بالد رۆزفێلت و ئەفسەری هەواڵگری باڵوێزخانەی ئەمریکا، لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا، کتێبی "تاسەی فێربوون،" نووسیویێتی: چارەنووسی قازی محەممەد زۆری

نەخایاند. قازییەکان هەر سیانیان رۆژی ٢٣ی ژانویە، لەمەهاباد، لەمە حکەمەی نیزامدا دادگایی بڕیاری ئیعدامیان دەرچوو. سەرەڕای دەرچوونی بڕیارەکە؛ بەڕێوەبردنەکەی لەلایەن تارانەوە، وەدواخرار؛ چونکە نەیاندەیوست لە جەنگی دانوستانە گرینگ و هەستیارەکانیاندا دەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا تووشی کۆسپ بێن. ماوەیەک بەر لەوەی فێبرییەی ١٩٤٧ لە تاران وەدەرکەوتم ژنڕاڵ رەزم ئارا چوو بووە مەهاباد. منیش پێم وابوو کە مەبەستی ئەو لەو هەفەرەدا چاودێریی بەسەر ئیعدامی قازییەکاندابووە. هەر بۆیەش بەپەلە خۆم گەیاندە، (جۆرج ئالێن)ی باڵوێزی ئەمریکا، بۆئەوەی بزانم چیان لەو بارەوە لە دەست دێ. پێی گوتم: تۆ تا چ رادەیەک چارەنووسی قازییەکانت بۆ گرینگە؟

ئێمە نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە ئەوان هاوکاریی سۆڤیەتییان کردووە. لە وەلامی ئەم باڵوێزەدا گوتم ئەوە راستە، بەڵام قازییەکان هەر لە بنەماوە ناسیۆنالیستبوون و بۆ ئاسایش و بەختەوەریی نەتەوەکەیان چیان لەدەست هاتووە کردوویانە. تەنیا سۆڤیەتییەکان بوون کە حەزیان لە یارمەتی و دۆستایە تیکردنیان بوو. ئەگەر ئەوانە لەسێدارە بدرێن؛ هەموو کوردە ناسیۆنالیستەکان ئێمە لەو کارەدا بەتاوانانباردەزانن. بالوێزەکە گوتی؛ دەی باشە، من چیم لەدەست دێ؟ گوتم داوا لە شا بکەن با بە رەزم ئارا بڵێ، قازییەکان بێننە تاران و لە دادگایەکی دادپەروەرانەو ئاشکرادا دادگاییان بکەن. باڵوێز. لەڕێوە، داوای چاوپێکەوتنی دەگەڵ شا کرد. شا لەو چاوپێکەوتنەدا هیوای خواست کە دادگای نیزامی باشتر بەڕێوەبەرێ. دواتر ئالێی بەشای گوتبوو؛ دیارە قازییەکان

هاوکاریی سۆڤیەتیانە کردووە، بەڵام بەمەبەستی پەرەپێدانی ڕۆشنبیری و پەروەردەو پێشکەوتنی کاروباری کۆمەڵایەتی زۆرکاریان کردووە. شا قسەکانی پێ دەبڕێ و بە بزەیەکەوە دەڵێ: لەوە دەترسێ فەرمانی تیرە باران و ئیعدام کردنیان بدەم؟ نامەترسە؛ من فەرمانی ئیعدامیان نادەم.

بەڵام ڕۆژی ٣١ی مارس لە کازیوەی بەیانیدا، قازییەکان بە فەرمانی شا لەدار دران. لێرە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە پاش چاوپێکەوتنەکەی باڵوێزی ئەمریکا بوو کە فەرمانی ئیعدامی قازییەکان دەرچوو.

سەدان وتار و بۆ چوون سەبارەت بەو ئیعدامانە لە بڵاڤۆکە نێوخۆیی دەرەکییەکاندا بڵاو بوونەوە. ڕۆژنامە بە ناوبانگەکانی ئەمریکا ئەوروپاو ڕۆژهەڵاتی ناڤین تێکڕا وتاری تێرو تەسەلیان لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان و داخوازیی مێژوویی کوردەکان بڵاوکردەوە و باسیان لە هەڵکەوتی ئیستراتژێکی کوردستانیان لەم ناوچەیەدا کرد. یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئێران نووسیبووی؛ خوێنی قازییەکان بۆنی نەوتی لێدەهات، ئەو قازییانە بوونە قوربانیی ئیمتیازی هەڵێنجانی نەوتی باکوور ئێران بۆ سۆڤیەت.

### چەند خاڵێك سەبارەت بە بۆچوون و بیروباوەڕی قازی محەممەد

بەرزبوونەوەی ئاستی تێگەیشتوویی و زانست لە نێو جەماوەری کورد دا، یەکێک بوو لە ئاواتەکانی قازی محەممەد کە پەرۆشی بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی خەڵکی کوردستان بوو؛ بۆیە پاش تەواوکردنی خوێندن و لە سەرەتایی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیدا

سەرۆکایەتیی ئەوکاتی "ئیدارەی پەروەردەی لەساڵی ١٣٠٥ی.ه – ١٩٣٦ی.ز دا لە مەهاباد وە ئەستۆگرت. لە ساڵی ١٩١٠ز – ١٩٣١زەوە دادوەری شەرعی ناوەندی موکریانی مەهاباد بوو. دواتر سەرۆکایەتی (معارف)ی وەلانا. بەڵام دیسانیش، بەردەوام سەردانی قوتابخانەکانی دەکرد و لەسەر نێوەڕۆکی کتێب و چۆنێتی پەروەردە و شێوازی وانەگوتنەوە زۆرشتی بەکەڵکی پێ دەگوتن. بۆ هاندانی لاوان لە وەرزش تۆپێن دا بە شداریی دەکردو لاوانی هان دەدا.

پاش رووخانی رژێمی پەهلەوی و لێکترازانی کاروباری وڵات، لە ساڵی ١٣٢٠ی.ه دا، نەیهێشت قوتابخانەکانی مەهاباد، داخرێن؛ چونکە خوێندن و پەروەردەی منداڵانی لە هەموو کارێک بێ گرینگتر بوو.

قازی محەممەد، لەسەرەتایی دامەزرانی کۆماردا ئەمری کرد، جلو بەرگی فۆرم بۆ قوتابیان دابین بکرێ. بۆ قەرەبووی ئاستی دواکەوتوویی و بەرزکردنەوەی ئاستی زانست زانیاری و پەروەردەی خوێندەواران؛ کە چرای هیوای داهاتووی ئەم نەتەوەیەبوون. چەند گرووپێ لاوی نارده تەورێز باکۆ، بۆ ئەوەی لەوێ فێری زانستی نوێبن و خوێندنەکەشیان تەواو بکەن. ئەم لاوانە لە بەشەکانی؛ نیزامی پزیشکی و مافناسیدا، لەو شارانە دەستیان کرد بە خوێندن، پێشەوا هەتا دوایین رۆژەکانی دەسەڵاتدارێتیی خۆی، لە خوێندن و فێرکردن خافڵ نەبوو، چونکە لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە نە خوێندەواری و نەبوونی رۆشنبیر و خوێندەوار هۆکاری داوکەوتوویی کوردن– بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کەموکوڕییانە، بەردەوام لە هەول دابوو. بەرپرسانی رێنوێنی دەکرد، وهانی دەدان

فێری زمانە ئەوروپییەکان بن، بۆ ئەوەی ئاشنابن بە شێوازە پێشکەوتووەکانی پەروەردە و راهێنان لە جیهاندا.

## بارزانییەکان دوای رۆیشتن لە مەهاباد چییان بە سەرهات؟

مەلا مستەفا و بارزانییەکان، باش گەڕانەوە لە شەڕگەی سەقز، هاتنە نێو مەهاباد و ماڵئاواییان لە قازی محەممەد و خەڵکی شار کرد. بە فەرمانی پێشەوا قازی محەممەد؛ نزیک بەسێ هەزار قەبزە تفەنگ سەت تیربار و چەند تۆپ کە لە عەمباری چەکو تەقەمەنی دابوون، دران بە هێزەکانی بارزانی.

هێزی ژێر چاودێری و فەرمانی مەلامستەفای بارزانی زۆر بە رێکوپێکی بەرەو ئاواییەکانی نێوان نەغەدەو شنۆو ناوچە سنوورییەکانی ئێران و عێراق کشانەوە. بۆ ئەوەی هەردەم رێگەی گەڕانەوەیان بۆ ناوچەی بارزان هەبێت. مەلامستەفای بارزانی لە مەهاباد و نەغەدە چاوی بەکار بەدەستانی سوپا شا کەوت. لەو چاوپێکەوتنانەدا. لەسەر ئەوەی رێک کەوتن کە مەلامستەفا و چەند فەرماندەیەکی بارزانی، بۆ درێژەی و تووێژەکان بچنەتاران- بەو جۆرە مەلامستەفا و هاوڕێیانی کە بریتی بوون لە سەرهەنگ عیزەت عەبدلعەزیز، سەرهەنگ میرحاج ئەحمەد و نووری ئەحمەد تەها بەرەو تاران وەڕێ کەوتن.

سەرتیپ هومایونی، سەرهەنگ غەفاری دەگەڵ ناردن. ئەوشاندە نزیک بە مانگێک لە باشگای ئەفسەرانی تاران مایەوە. لەو سەفەرەدا بەتێروتەسەلی دەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەت و سوپا و تووێژی کرد.

و لەلایەن شاوە پێشنیارگەلێکی سەبارەت بە چەک دانان و نیشتەجێ کردنی بارزانییەکان لە نزیکی هەمەدان بەوەقرەکە کرد. مەلامستەفا بەڕوالەت پێشنیارەکانی شای قبووڵ کردن و بڕیارلەسەردانەکەی هێشتەوە بۆ راوێژو پرس و رابە برا گەورەکەی، واتە شێخ ئەحمەدی بارزانی و پاش ئەوەی چاوی بەشێخ ئەحمەد کەوت بە سەرتیپ هومایۆنیی راگەیاند، کە شێخ ئەحمەد پێشنیارەکانی تاران قبووڵ ناکا ئەوجار خۆی بۆ بەرەنگاری و بەربەرەکانێ دەگەڵ هێزی لە سوپا ئامادەکرد. بارزانییەکان لە کۆتایی رەشەمەی ١٣٢٥– ١٩٤١ی.ز ەوە هەتا کۆتایی خاکە لێوی ١٣٢٦ی.ە -١٩٤٧- چەندین جار تووشی تێیکهەڵچوونی قورس و خوێناوی دەگەڵ سوپا بوون- لەو تێکهەڵچوونانەدا ژمارەیەک ئەفسەر و سەرباز لەئەرتەشی شا کوژران و بەدیل گیران، ئەو تێکشکانانە بوونە هۆی ئەوەیکە سەرتیپ هومایونیی لەسنوور چاوی بەفەرماندەری لەشکری عێراق بکەوێ، ژەنەراڵی عێراقی، عەلی حیجازی، بەڵێنی بە سوپا ئێران دا بۆ لە ناوبردنی هێزەکانی بارزانی هاوکاری ئێران بکا. لەو لاشەوە، سوپا تورکیاش لە سنووری ئێران - عێراق خۆی تەبار کرد؛ و بۆ شەڕ دژی بارزانییەکان خۆی سازدا. شای ئێرانیش فەرمانی لە ناوبردنی بارزانییەکان و پێش گرتنیانی بۆ گەڕانەوە بۆ خاکی عێراق دەرکرد و ئەمری کرد بە سەرتیپ هومایونی کە مەقەڕ و شوێنی چەک و تەقەمەنی و تۆپخانەی بارزانییەکان بۆردومان بکەن و بە هیچ شێوەیەک ئیزن نەدەن، بگەڕێنەوە نێو عێراق*. بەڵام بارزانییەکان لەچەند تێکهەڵچوونێکی

---

* ١- ئەوە یەکەمجار نییە و دوایین جاریش نابێ کە وڵاتانی داگیرکەری

دیکەش دا هێزەکانی سوپا دەبەزێنن و لە دوایین ڕۆژەکانی خاکە لێوەی ١٣٢٦دا گەڕانەوە نێو عێراق.

زۆربەی بارزانییەکان پاش گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق بە هۆی ئەوەیکە ژن و منداڵیان دەگەڵ بوو وێڕایی شێخ ئەحمەدی بارزانی خۆیان دایەوەدەست دەوڵەتی عێراق. بەڵام مەلامستەفا و ژمارەیەک لە لێهاتووترین و کۆڵنەدەترین بارزانییەکان، خۆیانبەدەستەوەنەدا. و پەنایان بردە بەرکێوە سنوورییەکانی ئێران و عێراق و تورکیا. دەوڵەتی عێراق لە شێخ ئەحمەد و بارزانییەکان خۆش بوو، تەنیا چوارکەس لە ئەفسەرانی کوردی عێراق کەڕیزەکانی ئەرتەشیان جێ هێشتبوو و هاتبوونە نێو بزووتنەوەی بارزانی؛ بە دەستووری دەوڵەتی نووری سەعید، ئیعدام و شەهیدکران. کە بریتی بوون لە سەرهەنگ (مستەفا خۆشناو، سەرهەنگ (عیزەت عەبدلعەزیز،) سەروان (خەیروڵلاعبدالکەریم،) سەروان (محەممەد مەحموود)*.

ئیعدامی ئەو چوار ئەفسەرە کوردە کە لە ڕاپەڕینی هەردوو کوردستانی عێراق و ئێراندا بەشدارییان کردبوو، سەرەڕای ئەوەی کوردەکانی دانیشتووی بەغداش زۆر هەولی ڕزگارکردنیان دان. بووە هۆی نارەزایەتیی بەربڵا و لە کوردەکانی عێراقدا. مەلامستەفا بارزانی و سێ سەت کەسی هەڵکەوتە بە ورەی قایم و لە سەر بڕیاری پێشووی خۆیان لە سەرەتایی جۆزەردان ١٣٢٦ی.ه دا لە

---

کوردستان دژ بە شۆڕشێکی ڕزگاریخوازیی کورد دەست دەدەنە دەستی یەک و کێشەکانی خۆیان فەرامۆش دەکەن. "وەرگێڕ"

* سەرهەنگ و سەروان: دووپلەی بەرزی سەر بازین- وەرگێڕ

کێوەکانی سنووری عێراق و تورکیاوە، چوونە، نێو تورکیەو پاش تێکهەڵچوون دەگەڵ ئەرتەشی تورکیە، دیسان هاتنە وە نێو ئێران و ئەوجار بە بڕینی سێسەد کیلۆمەتر، رێگا و چەندین شەڕوتێکهەڵچوون دەگەڵ سوپا دەهەزار کەسیی تا رۆژان رێپێوان لە زنجیرەی کێوەکانی زاگرۆس دا ئاخرییەکەی سەرەڕای سەرماو بەفر و باران بەو پەڕی بوێرییەوە، لە چۆمی ئاراس، پەڕینەوەو بێ هیچ زیانێکی گیانی، خۆیان گەیاندە دەوڵەتی سۆڤیەت و بەوکارە سەلماندیان کە هێزی باوەڕ و عەشق بە ئازادی و دیموکراسی کۆسپەکانی سەر رێ رادەماڵی. ئەم رێپێوانە مێژووییە؛ بە شەڕو دەکارکردنی تاکتیک و شێوازی جۆراوجۆری شەڕی پارتیزانی بوو بەدەرسێکی مەزن لە مێژووی کردەیی، پارتیزانی لە جیهان دایە چەشنێک بووە کە دەوانرێت دەبێ لە کۆلێژە نیزامییەکاندا کەڵکی لێوەر بگیرێ

## "دەسکەوتەکانی کۆماری کوردستان"

حکوومەتی کۆماری کوردستان لە ماوەی تەمەنی کورتی خۆیدا کە لە ساڵێکی کەمتر خایاند و سەرەڕای نەبوونی بەڕێوەبەرێییەکی بە ئەزموون و هەبوونی گەلێک دوژمنی نێوخۆیی و دەرەکی، گەمارۆی ئابووری، شێواوی باری ئابووری؛ حاڵەتی بەرگری لە خۆو ئامادە بوون لەبەرامبەر هێرش دا، گەندەڵیی بەجێ ماولە کردەوەکانی بنەماڵەی پەهلەوی و بەرپرسی ئیدارەکان؛ تازە خەریک بوو بە خۆدادەهات و دەرفەتی بۆ دەرەخساکە بە خۆی و چۆنێتی کارو باری خەڵک رابگا و بە هەبوونی کەسیەتیەکی لێزانی

وەک قازی محەممەد و بڕواو فیداکاریی بەڕیوەبەرایەتیی کە ڕۆڵەی ئەم نیشتمانە بوون.

لە هەلومەرجە نالەبارەدا کە ئەمریکا و بەریتانیا پشتیوانی دوژمنانی ئێمە بوون، توانیی بەهێزی بڕواو متمانە بە خۆ کارگەلێکی ئەوەندە، شیاو و گرینگی بکا کە لەمێژووی نەتەوەی کورد دا وەک کردەوەگەلێکی نەمر و بەنرخ بمێنێتەوە.

نەتەوەکانی ئێران بە چاوی خۆیان دیتییان کە نەتەوەی کورد، هەتا ئەوکات لە هەموو مافە ئیسانی و سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی بێ بەش کرابوو. ڕێژیمی پەهلەوی، خەڵکی کوردی لەو پەڕی هەژاری و داماوی دا هێشتبۆوە. خەڵک وایان لێهاتبوو کە تەنیا لە خەمی بژێوی ماڵ و منداڵ دابوون و لە ترسی کاربەدەستانی دەوڵەت و ژاندریە. بەدەگمەن، ڕوویان لەشاران دەکرد. ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو. زوڵمی کاربەدەستانی دەوڵەت و هەژاریی خەڵک لەو پەڕی خۆی دابوو. هەتا ئەوەی کە خوا بەفریای ئەوخەڵکە هەژارەهات و لە بەرەبەیانێی ڕۆژی ٣ی فەرمانانی. ١٣٢دا، دەوڵەتانی ڕووس و بەریتانیا بە بیانووی وەدەرنانی جاسووسەکانی ئەڵمانیا ئێرانیان بەزاند و لە باکوور و ڕۆژ ئاواو باشوورەوە هاتنە نێو خاکی ئێران و سێبەری نگریسی ڕێژێمی ڕەزاخان، شنەبای ئازادی هەڵیکرد و خەڵکی ئێران بە تایبەت کوردەکان لە خەو ڕابوون و بەبیستن هێزەکانی سوپای سۆڤیەت و بەریتانیا و بیتنی هەواڵی شەڕی دووهەمی جیهانی؛ دنیایەکی دیکەیان هێنایە بەرچاویان و وەک باڵندەیەک کە قەفەزەکەی شکابێ لە شەقەی باڵی داو بۆ ڕزگاری

لەو هەموو زوڵم و ستەمە و بۆ دەستە بەرکردنی مافی بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆیان کەوتنە بیری دامەزراندی دامەزراوە مەدەنییەکانی و کاروباری نەتەوەیی خۆیان بە دەستەوە گرت و پاش دامەرزاندنی حکوومەتی و دەوڵەت وێڕایی ئەو بەهلەوییان لە سەرخەڵکی ئێران هەڵگرت. دەگەڵ هەرەس هێنانی ڕێژەی ئەو هەموو ئاستەنگە توانیان کاروباری فەرهەنگی سیاسی، ئابووریی بەنرخ لە پێناو بەرەوپێش بردن و دابینکردنی ژیانی خەڵکدا راپەڕێنن هەرچەند تەمەنی کورتی ١١مانگەی ئەو حکومەتە ، ئیزنی دەست پێڕاگەیشتن بە کاروباری بنەمایی نەدان، بەڵام دیسان سەرەڕای تەواوی ئەو کەموکوری و ئاستەنگانە؛ ئەم گەڵاڵە و بەرنامانە بەڕێوەچوون و حکوومەتێک دامەزرا کە بووە مایەی شانازیی هەرچی کوردە. ئەم کردەوەوکارانە بریتیی بوون لەمانەی خوارەوە:

١- زمانی کوردی وەک زمانی فەرمی قوتابخانە و دایرەکان راگەیەندرا.

٢- فێرکردن و خوێندنی ئیجاری بە خۆڕایی بۆ منداڵان و دابینکردنی یۆینفۆرم بۆ قوتابییەکان (ساڵی دوودەست شمەکی خۆڕایی؛ زستانی و بەهاری)

٣- پێکهێنانی کلاسی خوێندن بۆ گەورەکان و خەبات دژی نەخوێندەواری.

٤- دامەزراندن و وەگەڕخستنی چاپخانە بۆ چاپی، رۆژنامە و گۆڤار و کتێب.

٥- دەرکردنی چەندین گۆڤار و رۆژنامە بەزمانی کوردی؛ بۆ وێنە رۆژنامەی کوردستان و گۆڤاری "هەڵاڵە" و "هاواری نیشتمان"، "گروگاڵی منداڵانی کورد" و چەند بڵاڤۆکی دیکە و کتێبی دەرسی سەرەتایی.

٦- پێکهێنانی هێزی رێکوپێک و چەکدار (هێزی پێشمەرگە) بۆ پاراستنی ئاسایشی نێو خۆیی و بەرگریی لە حکوومەتی میللی.

٧- دامەزراندنی کۆمیتەی ژنان و چەسپاندنی مافی یەکسان بۆ ژن و پیاو لە تەواوی کار و چالاکییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

٨- پێکهێنانی کە کەشێکی پڕ لە ئاسایش و هێمن بێ وێنە لە هەموو ناوچە ئازاد کراوەکاندا.

٩- پێکهێنانی پەیوەندیی بازرگانی دەگەڵ دەرودراوسێ بەمەبەستی بووژاندنەوەی ئابووری و بایەخدان بە کشتوکاڵ.

١٠- هەراش ترکردنی بوارە فەرهەنگییەکان ناردنی قوتابی و خوێندکار بۆ خوێندنی باڵاو ناسینی دوایین زانستە نۆێکانی ئەوکاتی جیهان.

١١- هێنانە گۆڕێی داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد لە کۆڕوکۆمەڵە نێودەوڵەتییەکاندا بۆ نموونە لە کۆنفرنسی پۆتسدام و ناساندنی نەتەوەی کورد بە نەتەوەکانی جیهان. ئەوانە کورتەیەک لەوکارە بنەمایی و گرنگانە بوون کە لە ماوەی تەمەنی کورتی حکوومەتی کوردستاندا، بەرێبەرایەتیی قازی محەممەد کران - خەڵکی کورد زۆر لە مێژساڵ بوو، لە دیدێتی و زۆڵم و دەست بەسەریدا پەلەقاژەی بوو. بێ بەش لە تەواوی مافە ئینسانی و تەنانەت مافی هاووڵاتییش.

لە تورکیە بە کوردەکانیان دەگۆت تورکی کێوی و لە عێراق بە بێگانەیان دەزانین و لە ئێرانیش گەرچی جاروبارە وەک ئارییایی رەسەن، ناویان دێنان، بەلاّم بەکردەوە راست بە دژی ئەم وتەیە دەجوولانەوە. کوردەکانیان تەنانەت بەهاولاتیی پلە سێهەمیش دانەدەنا. ئەم خەڵک هەتا ساڵی ١٣٢٠ی.ه- ١٩٤١ی.ز- لە باری رۆشنبیری و ئابووری تەندروستییەوە لەوپەڕی هەژاری دابوون و لە هەرچی پشتیوانیی یاساییە پێ بەش بوون و ئەوەندە لە ژێرگوشار و زوڵمی کاربەدەستانی ئیداری و نیزامدا چەو سابوونەوە، ئەو سەری دیارنەبێ. لە ئاواییەکانی کوردستان، ئەگەر ژاندرامەیەک هاتبایەتە نێو ئاوایی، خەڵک لە ترسان بەرەو مەزار و کێو تێیان دەتەقاند. بە هاتنی هاوپەیمان و هەلاّتنی فەرماندەرەکانی سوپا و هەڵۆەشانەوەی حکوومەتی پەهلەوی و پستانی زنجیری دیلێت، خەڵک چاو و گوێیان کرایەوە و لە دیلێت و کۆیلەیی چەند ساڵەی خۆیان تێگەیشتن و وردەوردە کەوتنەوە بیری پێناسەی شوناسی نەتەوەیی و مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان. لە راستیدا ئەوە یەکەمجار بوو کە ئەو میللەتە رزگاریبوو و بە ئاواتە لە مێژینەکانی خۆی گەیشت و توانیی چارەنووسی خۆی لە بەشێک لە خاکی کوردستانی دابەشکراودا، دیاری بکاو ببێ بە خاوەنی رێبەرێکی دڵسۆز و فیداکارو هێزێکی چەکداری کۆڵنەدەر و رێکخراو گەلی خەڵکیی و، بتوانێ بەزمانی نەتەوەیی خۆی بدوێ و بخوێنێ و جلوبەرگی نەتەوەیی خۆی بپۆشی و داب و نەریتی خۆی زیندووکاتەوە. بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردستان لە ساڵەکانی ٢٤ و ٢٥دا، دەگەڵ هەموو بزووتنەوەکانی دیکەی ئەم میللەتە، جیاوازییەکی

بەرچاوی هەبوو. ئەگەر راپەڕینەکانی رابردوو تایبەتمەندیی و رەنگی عەشیرەتی و تایفەگەرییان پێوە دیار بوو لە ناوچەیەکی بەرتەسک یا لەلایەن عەشیرەتێکی تایبەتەوە رێک دەخران ئەمجارەیان حکوومەتی میللی لە لایەن چینی رووناکبیر و ئازادیخوازی کوردەوە بەرێبەراتیی قازی محەممەد، سەری هەڵدا بوو و زۆربەی، خەڵکیش چالاکانە تێیدا بەشدار بوون و رۆژ بە رۆژ ژمارەی دۆستان و هۆگرانی لە ئاستێکی بەربڵاودا لە نێوخۆ و دەرەوەی وڵات، زیادیان دەکرد. حکوومەتی کورد لە گەندەڵی و ملهوڕی و بەرتیل خۆری بەدوور بوو. پەناگەیەک بوو بۆ هەموو ئازادیخوازانی کورد و غەیرە کورد و جێی هیواو شانازی تەواوی رووناکبیرە ئێرانییەکان بوو تەواوی چین و توێژەکانی شار و دێ حکوومەتی کوردستانیان بەهی خۆیان دەزانی و بەوپەڕی تامەزرۆیی و عەشقەوە لەبەشە جۆراو جۆرەکانیدا بەشداربوون، بەچەشنێک ئەوانەی وا لەدەرەوە دەهاتنە کوردستان؛ سەریان لەو هەمووە کاری دڵسۆزییە سووڕدەما. "ئارچی باڵد روزڤێلت" لە گێڕانەوەی سەفەرەکەی مەهابادی‌دا دەڵێ: "مرۆڤ لەو کەشە ئازادەی لە مەهاباددا هەیە واقی وڕدەمێنێ". بەڕاستی مەهاباد لەو کاتدا غوونەی بەرچاوی ئازادی و دیموکراسی بوو، لە هەموو ئێراندا. لەمەهاباددا هیچ کەس لەبەر باوەڕ و بیروبۆچوون نەدەگیرا. لە حکوومەتی کوردستاندا زیندانیی سیاسی هەرنەبوو- خەڵکی مەهاباد و ناوچەکە لەو پەڕی ئازادیدا بیروباوەڕی خۆیان دەگوت. گوێیان لە رادیۆ گەلی بیانی رادەگرت و لە رۆژنامە و چاپەمەنییەکانی کوردستاندا سانسۆر هەرنەبوو، هەموو کەسێک لە نووسینی بیروباوەڕی خۆیدا ئازاد بوو. خەڵک

بەوپەڕی هۆگرییەوە بەشوێن کۆکردنەوەی زانیاریی زیاتر دادەچوون. ئەوە تەنیا بیروباوەڕی خەڵکی مەهاباد نەبوو. بەڵکو هەرچی لە دەرەوەی شارەوە دەهات، ئەوەی بە چاوی خۆی دەدی. ئازادیخوازانی ئێران بە چاوی رێزەوە سەیری دۆزی ناوچە و

ریزی یەکەم- لە راستەوە بۆ چەپ عەبدولرەحمان شەرەفکەندی (هەژار)، قازی محەممەد، محەممەدئەمین شێخولئیسلامی (هێمن) ریزی دووەم- عەبدولرەحیمی قازی، محەممەد نانەوازادە، سدیق حەیدەری، عەزیز سدیقی

ئەزموونی دیموکراسی و ئازادییان لەو بەشەدا دەکرد و هیواداربوون بەوەی دیموکراسی کوردستان کاریگەریی راستەو خۆبکاتە سەر ناوچەکانی دیکەی ئێرانیش.

چونکە ئەو راپەڕینەی بەڕێبەرایەتیی قازی محەممەد، سەری هەڵدابوو خوازیاری، دیموکراسی بوو بۆ هەموو ئێران و هەوڵی

دەدا لە ئێران دا سیاسەتێکی سەر بەخۆی میللی هەبێ و پێش بگرێ بە زوڵم و بەرتیل خۆریی کاربەدەیستان و هەڵاواردن و جیاوازی نەکردن یەکێک لەویستەکانی دیکەی ئەوە بوو کە پەیوەندیی بکا بە ئازادیخوازانی دیکەی ئێرانەوە و بەرەیان دەگەڵ پێک بێنێ و بزووتنەوەی میللی کوردستان بەشێک بێ لە بزووتنەوەی میللی ئێران - بێ لایەن بوون لە کردەوەی توندوتیژانەی کۆمۆنیستی؛ رۆژ دەگەڵ رۆژ دژی گەندەڵیی کۆمەلایەتی و بیری کۆنەپەرستی خەباتیان دەکرد. گرینگییەکی یەکجار زۆری دەدا بە پەرەپێدانی فەرهەنگ و گەشە کردنی باری خوێندەواریی خەڵک- هاوکات بۆ بەرەو پێش بردن و گەشەی ئابووری و کۆمەلایەتی و باری تەندروستیی و ژیانی خەڵکیش، بەردەوام لەکاردابوون. ئەوانە هەمووی نیشانەی پێشکەوتنخوازیی حکوومەتی کوردستان بوون و بەدڵنیاییەوەوە، ئەگەر زیاتری بە بەرەوە بوایە شوێنەواری بە نرختری ئەو کردەوانە بەر چاوتر دەبوون و گاریگەریشیان لەسەر ناوچەکانی دیکەی ئێران زیاتر دەبوو. بەڵام بەداخەوە. ئەجەل مەودای نەداو تەمەنێکی ئەوتۆی بەسەر نەبرد.

ئەگەرچی حکوومەتی کوردستان، ئاوات و داخوازیی نەتەوەیی هەبوو خەباتیشی دەکرد بۆ نەهێشتنی ستەمی نەتەوایەتی دابینکردنی مافە رەواکانی نەتەوەی کورد، بەو حاڵەشەوە حکوومەتێکی، دوگم و بەرچاوتەنگ نەبوو. خوازیاری دۆستایەتی و هاوکاری بوو دەگەڵ تەواوی ئازادیخوازانی ئێران و جیهان. پێشەوا قازی محەممەد، بە پێداگرییەوە دەیگوت: ئێمەی کورد بزووتنەوەی ئازادیخوازانەمان لە هەوڵی ئازادیخوازیی فارس و ئازەرییەکان بە

جودا و جیاواز نازنین. ئێمە دژی کردەوە و ئەو هەڵاوێردانەین کە دەسەڵاتدارانی ئێران، دەرهەق بە ئێمە دەیکەین، ئەوان کە وێڕای دوژمنایەتی دەگەڵ ئێمە، دوژمنی ئازادیخوازانی فارس و ئازەریش هەن. ئێمە بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانمان وێڕای هەموو نەتەوەکان و ئازادیخوازانی ئێران، دژی دوژمنێکی هاوبەش، خەبات دەکەین"

بزووتنەوەی نەتەوەی کورد، بۆ دابینکردنی مافەکانی نەتەوەکەی و لابردنی ستەمی دووفاقە و پێکهێنانەکەشی لەگەڵ یەک هەڵکردن و و لێک تێگەیشتن؛ شان بەشانی میللەتانی دیکە، خەباتی دەکرد. ئەو تایبەتمەندییە ناوازەیەی حکوومەتی کوردستان نەیارانی ناچار دەکرد؛ بۆ پاساودانی دژایەتی و دوژمنایەتییەکانیان لە دژی ئەو حکوومەتە پەنابەرنە بەرهۆو تۆمەتی بێ جێ و لە پێشدا: بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردستان بە ئاکامی نەوانی حکوومەتی سۆڤیەت دابنێن کە کوردەکان دەیانهەوێ لە ئێران جیا ببنەوە. لەحاڵێکدا لە بەرنامەو پێڕەوی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا، بەراشکاوی باس لە دیموکراسی بۆ ئێران و خود موختاری بۆ کوردستان کراوە. سەربارەت بەیارمەتیی سۆڤیەتیش پێویستە بڵێین؛ ئەگەرچی سۆڤیەت بەرواڵەت دژایەتیی داخوازییەکانی کوردی نەدەکرد، بەڵام لە دامەزراندنی حکوومەتی کوردستاندا، هیچ رۆڵێکی نەبوو، نەشی دەویست کوردستان لە ئازەربایجان جیابێ. نەنیاویستی نەتەوەی کورد پێکهێنانی ئەو حکوومەتە بوو، بۆ ئەوەش هەر ئەم خەڵکی کۆڵان و بازاڕەی لەپشت بوو. دیتیشمان پاش بەسترانی پەیماننامەی نەوتی باکوور، سۆڤیەتییەکان چۆن پشتی کوردیان بەردا و بەراشکاوی دژی

پێشڕەویی کوردەکان و هێزی رزگاریخوازی کوردبوون بەرو باشوری کوردستان و ناوچەکانی سنە و کرماشان. بۆیە لەلایەن هاوشمۆفی بالوێزی سۆڤیەتتەوە لەورمێ دژایەتیی راشکاوانەی خۆیان دەربڕی و نەیانهێشت بزووتنەوەی کوردستان پەرەبگرێ و پەل بهاوێ. لە نووسراوە و قسەکانی ئەو کاتی سەرکردەکانی کورد دا هیچ ئاماژە و باسێک لەسەر جوداییخوازیی نەکراوە و قازی محەممەد زۆر جاران بەروونی دیگەت "حیزبی دیموکرات لە چوار چێوەی ئێرانێکی ئازاددا تەنیا خودموختاریی دەوێ"

هەڵبەت ئەم هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ. گەرچی ئەوان توانییان بۆ ماوەیەک ویستە ئینسانییەکانی کورد پێ شێل بکەن؛ بەڵام دوژمنانمان دەبێ بزانن؛ ئەو میللەتەی ماف و شوناسی خۆی ناسیو؛ ئەو میللەتەی دەزانێ کێیەو کوێ نیشتمانێتی و چی دەوێ و بەواتایەکی تر لە کوێی جیهاندا هەڵکەوتووە، و بۆ دەستەبەرکردنی مافە زەوت کراوەکانی؛ بەهەموو توانایەوە تێدەکۆشێ و گیان بەخت دەکا؛ بەدڵنیاییەوە هیچ کات لەمافەکانی خۆی نابوورێ. ئەمڕۆکە بزاڤەفیکری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی جیهان؛ پشتیوانی راستەقینەی ویستەکانی کوردن. دوارۆژی کورد روونە و رەوایی و بوونی ئەو نەتەوەیە؛ پێگەی راستەقینەی خۆی دۆزیوەتەوە.

**مارند وخراباکی و دیوانه و مستیم پوشیده نماناد همنییم که هستیم**

## دوور بیرەوەریی

قازی محەممەد لە رادەبەدەر حەزی لە دروستبوونی هێمنی و ئاسایش لە کوردستاندا بوو- تا ئەو جێیەی لە تواناشی دابایە، پێشی بە توندوتیژی و ئالۆزی دەگرت. لە تەواوی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەودا؛ تەنیا کەسێک کوژرا، ئەویش میزرا غەفووری مەحموودیان بوو کە بە فەرمانی راستەوخۆی "نماز عەلیۆف"ی فەرماندەی نیزامیی سۆڤیەت لە مەهاباد تیرۆرکرا. کاتێک ئەو هەواڵەیان دایە؛ زۆر تووڕەو نارەحەت بوو و گوتی: "من دەگەڵ ئەم جۆرەکارانەنیم و رازی نیم". سەربارەت بەبڕیاری دادگا و شەرعیش دوو نموونە هەیە کە ئەوانیش پێشاندەری ئەو کردەوانەن لەپێناو پاراستنی هێمنی خەڵکی ناوچەکەدا کران.

١- بەرێوەبردنی حوکمی تۆڵە (قصاص) لە لایەن دادگا و مەحکەمەی شەرعی مەهابادەوە لەسەر کەسێک کە پیاوی کوشتبوو. بنەماڵەی کوژراو لێی خۆش ببوون. بەڵام جەنایەیە کە وەهابوو کە سەرەڕای ئەوەش بەپێی بڕیاری دادگا؛ بکوژ تۆڵەی لێکرایەوەو حوکمی لەسەر بە رێوە چوو.

٢- دادگایی کردنی دوو پێشمەرگە کە لە میاندواو ئازەرییەکیان کوشتبوو؛ لە باخی پێشاهەنگی مەهاباد، بەرێوە چوو کە تێیدا ئەو دوو پێشمەرگەیە مەحکووم کران بە ئیعدام. ئیدی خەڵک هیواو متمانەیان بە دادپەروەریی حکوومەتی کوردستان زیاتربوو. یارمەتی کردنی خەڵکی خۆجێیی و میوان و ئەوانەی لەدەرەوە رادەهاتنە کوردستان؛ تایبەتمەندیی رەوشتیی قازی بوو. هەروەک باسم کرد لەسەردەمی لاوێتیدا سەرۆکی

"معارف[1]" بوو. دوای مەرگی قازی عەلی و وەرگرتنی بەرپرسیارەتیی داوەریی شەرع زۆر شێلگیرتر دەستی کردبە سەراسوێی خەڵک و چارەسەرکردنی گرفتەکانیا لە رێگەی دایرە و ئۆرگانە پەیوەندیدارەکانەوە دەرگای "مەحکەمەی قازی" بۆ هاتنی میوان و لێقەوماوان هەمیشە لەسەر پشت بوو.

حاجی سەرداری هەوشار برا گەورەی یەمین لەشکر کە، دەست رۆیشتووترین و بە حورمەتترین دەوڵەمەندانی ناوچەی تکاب و هەوشار بوو، لە سەردەمی حکوومەتی رەزاخاندا تۆمەتبار کراو، چونکە زۆر دەوڵەمەند بوو، خەریک بوو تەشقەڵەیان پێ دەکرد. هەر بۆیەش بانگکرایە مەهاباد. حاجی سەردار چووە ماڵی قازی محەممەد و دواتر گرفتەکەی بەهۆی نێوبژیوانیی قازییەوە چارەسەربوو.

## "بیرەوەرییەکی دیکە"

باسی ئەوەمان کرد کە لە گەلاوێژی ١٣٢٥ی.ه – ١٩٤٦ی.ه دا قازی محەممەد، ویستی سەردانێکی باکووری کوردستان بۆ شارەکانی (ورمێ) و (سەلماس) و خۆی و ماکۆ بکا. بۆ ئەوەی وێڕای سەراسوێ و بەسەرکردنەوەی ناوچەکە و دیدار دەگەڵ کوردەکانی ئەوێ؛ هەنگاوێکی بەکەڵک هەڵگرێ، بەمەبەستی وەک خۆی بێ و لێک تێگەیشتنی باشتر لە نێوان کوردو ئازەرییەکانی ئەو شارانە و هیوادارتر و دڵگەرمترکردنی کوردەکانی باکووری کوردستان، ئەو رۆژەی حازربوو لەمەهابادەوە بەرەو ورمێ وەرێکەوێ سەرۆک عەشیرەتەکانی مەهاباد و ژمارەیەکی زۆر لە

(١) معارف: دایرەی پەروەردە.

چین و توێژە جیاوازەکانی شار و کاربەدەستانی حیزب و دەوڵەتی کوردستان لەحەوشەی شارەداری و گۆڕەپانی چوارچرا کۆبوونەوە بەمەبەستی بەرێکردنی پێشەوا قازی. جەماوەر شەپۆلی دەدا. سەرۆکی عەشیرەتان یەک بەیەک دەهاتن پەیمانیان دەگەڵ نوێ دەکردەوەوە ژمارەیەکی زۆریش بەتاسەوە دەچوون زیارەتیان دەکرد. قازی محەممەد، لەوتەیەکدا بۆ رێز و سوپاس لە خەڵک؛ خەڵکی کورد، عەشیرەت و هاوولاتیەکانی هاندا بۆ یەککرتوویی. لەنێو کەفوکوڵی بێ وێنەی ئەم خەڵکەدا دەگەڵ حاجی بابە شێخی سەیادەت (سەرۆکی هەیئەت رەئیسەی میللی)، سواری ئوتومبێل بوو. نووسەری ئەم دێرانەش یان رەگەڵ کەوت. دوو لۆریی پڕ لە پێشمەرگە و دووجیپی نیزامی بە چەند ئەفسەرێکەوە لە پێش و دواوەی ماشێی پێشەواوە دەهاتن لەچەند کیلۆمەتریی شارەوە بە ئەمری پێشەوا ئەو ماشێنانەی بەرێیانە دەکردین، گەڕانەوە. هێشتا لە شاروێران دوورنەکەوتبووینەوە بەپێی گەنجێتی لەسەر رووی خۆم هەڵماڵی و گلەییەکم لێ کرد و گوتم: "حەزرەتی پێشەوا! رێزت لەهەموو خەڵک و عەشیرەتان گرت و سوپاست کردن، بەڵام فەیزوڵلا بەگیتان فەرامۆش کرد، ئەوان کە کەسوکاری خۆتانن، ئاورێکیتان لێنەدانەوە." پێشەوا هەر بەو دڵۆڤانیە هەمیشەییەی خۆیەوە فەرمووی. کورم نارەحەت بووی؟ ئیدی ئەو چەند بەیتە شیعرەی بۆ خوێندمەوە کە بەداخەوە ناوی شاعیرەکەیم لەبیر نەماوە:

دلا یاران سەقمند اربدانی

زبانی اندونانی اندوجانی

بەنانی نان بدە از دربرانش
نوازش کن بەیاران زبانی
ولیکن یار جانی را نگهدار
بەجانش جان بدە گرمی توانی

حاجی بابە شێخ فەرمووی؛ قوربان، راست دەکا؛ زۆربەی ئەم سەرۆک عەشیرەتانەی ئەمڕۆ پەیمانیان نوێ کردەوە، روو ڕاست نین و ئەگەر دەسەڵاتم بوایە، هەر بۆ خۆم هێندێکیانم محاکەمە دەکردن و سزام دەدان."

ئەوەی کە هیچ کات فەرامۆشی ناکەم و مێژووی کوردستان و خەڵکی کوردیش نابێ لە بیریکەن ئەوەیە پێشەوا فەرمووی؛ جەنابی حاجی بابە شێخ؛ هەر بزووتنەوەو حکوومەتێک لەسەر کشتو کوشتاری نەیار و دژبەران دامەزرابێ مەحکوومە بە لە ناوچوون و دەبێتە پەندی زەمانە. بەڵام بە پشتیوانیی خودای، من نیازم وایە حکوومەتی کوردستان بێ کوشتار و خوێن رێژیی بەرەوپێش بەرم"

پێشەوا قازی محەممەد هەرکاتێک لە بەدقەولی یا پەیمان شکێنی دۆستێک یا لە بێ بەڵێنیی دەوڵەتی ئێران ناڕەحەت بایە و ناچار بایەردانی بەجەنگی دانابا؛ زۆر لەسەرە خۆو هێمنانە داخ و کەسەری خۆی بە نیسبەت چارەنووسی نەتەوەکەی دەردەبڕی و دەیگوت: ئەی کوردەکەی، بێ چارەکەی، بێ پارەکەی، بێ یارەکەی، بێ کارەکەی."

بەڵێ؛ بەڕاستی هەر لە کۆنەوە کوردەکانیان بێ پووڵ و بێ یارو بێ کارکردەوەو بە شێوازگەلی جۆراوجۆر ئازار و ئەشکەنجەدراون

و سووکایەتیان پێ کراوە و ئەگەر ئەو لەم بارودۆخەی ئێستادا زیندوو بایە، چەمکی "ئاوارەشی" لێ زیاد دەکرد و دیگوت: ئەی کوردەکەی ئاوارەکەی. بێ چارەکەی، بێ پارکەی- بێ یارەکەی بێ کارەکەی. کە لەڕاستیدا ئەو خۆی جۆرێک شین گێرییە بۆ چارەنووسی کورد.

## بیرەوەرییەکانی ئارچی بالد رۆزڤێلت[1]

کەسایەتیی بە نێوبانگی مەهاباد؛ قازی محەممەد بوو کە بۆ دادوەریی شەرعی هەڵیان بژارد- بووە کتێبخانەیەکی بەمیرات پێ گەیبوو کە کتێب گەلێکی تێدابوو بە -٧- زمانان. قازی، لەو کتێبخانەیە دەیخوێندەوەو زانیارییەکانی خۆی لە بوارەکانی دیکەشدا برەو پێدا. هەر بۆیەش لە یەکەمین ساڵەکانی چوارەمین دەیەی ژیانی خۆیدا بێجگە لە پلە و پایەی دادوەریی شەرعی لە سایەی بیروهزری پاراو و لێهاتوویی پێگەیەکی تایبەتیی لەشاردا هەبوو.

روڤێلت لە شوێنێکی دیکەی بیرەوەرییەکاندا دەنووسێ: لە دیدارێکدا بەقازی محەممەدم گوت: هاتو ینەتە کوردستان بۆئەوەی وەزعی کوردەکان تاوتوێ بکەین و راپۆرتەکەی بدەینەوە بەدەوڵەتەکەمان. هیواداریشین کوردەکان وەزعیان باشتربێ و تەنیا جۆرێک لەسەرەڕۆیی بە جۆرێکی دیکەی سەرەڕۆیی نەگۆڕنەوە". قازی محەممەد، گوتی؛ خەڵک لەوبەشانەدا کە لەژێر دەسەڵاتی مندایە ئازاردن لەدەربڕینی ئەو شتەی دڵیان دەیخوازێ و حەزیان لێیەتی" لەوڵامدا گوتم؛ "بەچاوی خۆم دەیبینم وایە. لە ئازەربایجانی

(١) ئارچی باڵد روزوێلت؛ تاسەی نووسین. وەرگێڕان بۆ فارسی؛ صبا سعیدی.

دیموکرات دا خەڵک تەنیا ئزنیان هەیە گوێ لە رادیۆی تەوریز و مۆسکۆ بگرن. لە خالێکدا من دوێنێ شەوێ لێرە گوێم لە رادیۆی لەندەن و ئەنکەرە بوو." کاتێک سەربارەت بە پۆستەرە تەبلیخاتییەکانی سۆڤیەت کە بە دیوار درابوون قسەم کردو گوتم پێم سەیرە. ئەو گوتی؛ کوردەکان ناچارن هەرکەس یارمەتیان بدات لێی وەرگرن، بەڵام سەر بۆکەس دانانوێنن. ئێمەی کورد سکاڵایەکمان دابە سێ وڵاتی سەرکەوتووی بەشدار لەکۆنفرانسی ئەوروپیی "پۆتسدام" بەڵام بەریتانی و ئەمریکییەکان ئاوڕیان لێ نەدایەوە. هەروەها ئاماژەی بە بەیاننامەی ئاتلانتیک کردو گوتی: "تەواوی کوردەکان هیواداربوون وڵاتە یەگکرتووەکانی ئەمریکا بۆ قەرەبووی دواوکەوتوویییەکانی کورد، یارمەتیی ئەو نەتەوە بدا" ئەو وتی: چ دەبوو ئەمریکا لەجیاتی ناردنی سی هەزار سەربازە تەنیا - ١٠٠- سەت مامۆستای ناردبایە ئێران؟ بەڵام ئەمریکا بەجێی یارمەتی دای بە ئێمە پشتیوانیی لە دوژمنانی ئێمەکرد. ئەویش بە دانی چەکو تەقەمەنی بەوان بۆ سەرکوتکردنی ئێمە" لەپاشان ئەو بەکورتی هێندێ لۆمەی بەریتانیاییەکانی کرد و ئاماژەی بە کردەوەکانیان سەربارەت بەسەرکوتکردنی کوردەکان لە سەدەکانی رابردوودا، کرد هەتاگەیاندییەوە مەلامستەفا بارزانی. رووڤێلت سەربارەت بەسەفەرەکەی بۆ ئەم ناوچەیە دەڵێ: لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا ئیدی بەو قەناعەتە گەیشتبووم کە قازی محەممەد بەیارمەتی سۆڤیەت توانیویتی حکوومەتێکی تەواو سەربەخۆ دامەزرێنی، ئەگەرچی قازی محەممەد سۆڤیەتی بە باشترین دۆستی خۆی دەزانی، بەڵام سۆڤیەتییەکان بە ئاشکرایی دەستیان

لەکاروباری نێو خۆیی کوردستان وەر نەدەدا. راپەڕینی قازی محەممەد راپەڕینێکی ناسیۆنالیستی بوو؛ بەشی هەرە زۆری کوردی پارچەکانی دیکەش قبووڵیان بوو."

ئەوە داوەریی و بیروڕای کاربەدەستێکی پایەبەرزی ئەمریکییەکە دەوڵەتەکەی دژی بزووتنەوەی میلیی کوردستان بوو.

## "بیرەوەرییەکانی ئاغای مەهدی نیا"

ئاغای جەعفەری مەهدی نیا لە کتێبی "ژیان نامەی قەواموسوڵتەنە"دا سەبارەت بە دادگایی قازییەکان لە دادگای سەرلەنوێ پێداچوونەوەی نیزامیدا دەنووسێ: محەممەدی قازی پیاوێکی بەگفت ولفت و بەدمودووبووە و پێویستی بە پارێزەر نەبووە. ئەو بەنیسبەت دووانەکەی دیکە وەک فەرماندەو ئەوانیش وەک فەرمانبەر بوون. هەتا ئیزنی نەدابایەن دانەدەنیشتن- لە دوایین داکۆکییەکانیدا؛ گوتی پێتان وانەبێ ئاگاداری یاسا نەبووم بەڵکو لێم سوور بوو تەنانەت پێش گەڕانەوەی سوپا لێکمدابۆوە کە من لە دار دەدرێم. بەڕاشکاویش باسی لە وەکرد کە ئەدی چۆن بوو رای نەکرد؟ گوت؛ پێتان وانەبێ نەمتوانی، بەڵکو شەش ئوتومبێلی سواری و جێپ لە بەردەستم بوون و هەرکات و ساتێک حەزم لێ بوایە دەمتوانی بۆی دەرچم. بەڵام خاترجەم بن، من پیشەوەری نیم لەتەنگانەدا هەڵێم. بۆ کوێ هەڵاتبایەم؟ ئێرە کوردستانە و هێشتا گۆڕی هەشت پشتم لێرەماوە. دیسان دەنووسێ: رەوتی دادگایی کە لەسەیەک -٤٨- سەعات خایاند، ئاسایی بوو؛ تەنیایەک دووجار نەبێ کە دادستان لەقسەکانی دا بەتوورەیی تۆمەتبارکراوانی دواند و

قازی محەممەد قەڵس بوو و شاڵای بۆ بردو دادگا شێواو بووە هۆی کۆتایی هێنان بەکار و پشوودان.

کاتێک پێشنیاری رۆشتن لە کوردستانیان بە قازی دا؛ قازی محەممەد گوتی؛ دەزانم بە مانەوەم لە مەهاباد دا ژیانم دەکەوێتە مەترسییەوە. بەڵام من لە سەر سوێندی خۆم سوورم و خەڵکەکەم بەتەنێ بەجێ ناهێڵم."

ئەوەش نموونەیەکە لە بیرو بۆ چوونەکانی نووسەرێکی ئێرانی کە بەنیسبەت کوردەکان نیازپاک نەبووەو و شێوەی باسکردنی رەوتی دادگاو ئەو رستە و چەمکانەی هێناونیەوە بەوپەڕی ناحەزییەوە بەکاری هێناون.

## "بەشێك لەبیرەوەرییەکانی مەحموود تەفەزولی نووسەرو وەرگێڕی بەناوبانگی ئێرانی"

کورد لە هەر جێیەک بێ ئێرانییە.

لەو بەری سنووری رەسمییەکانی ئێرانەوە جەلال تاڵەبانی دەڵێ؛

کێشەی یەکگرتووی کوردستان پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەیەو گەلێ کۆسپی لە پێشە... مەسەلەی یەککگرتوویی کورد؛ گەرچی ئێستا لە ئارادانییە، بەڵام بەومانایە نییە کە کوردەکان لە ئێران جیا ببنەوە لەوانەیە رێژیمێکی دیموکراتێک لە ئێرانداپێک بێ و کە کوردەکان بتوانن لە ژێر سێبەری دا بەهەموو ئارمانجەکانیان بگەن و کوردستانی ئێران ببێتە ناوچەیەک بۆ وەخۆگرتنی کوردستانەکان

و لەجیاتی جیابوونەوە، ببێتە هۆی ئەوەی هەموو کوردەکان بە ئێرانەوە بلکێن"

من لە دەمارگیری بێزارم هەروەها لە دمارگرژی میللی و نیشتیمانیش کە پێی دەگوترێ شۆڤینیزم بێزارم- بەلام بڕوام بە مافی خەلک و نەتەوەکان و بەئازادیی مرۆڤ و مرۆڤایەتی هەیە و لە سەر ئەو بڕوایەم کوردەکان رەسەنترین ئێرانیین ئەوەهەلەیەکی گەورەیە ئەگەر خەلکی ئێران و دەولەتی ئێران و دەسەلاتدارانی ئێران ئەو حەقیقەتە لەبەرچاو نەگرن و حاشای لێ بکەن، چونکە ئاوا بەشێک لە خۆشەویسترین رۆلەکانی لە خۆی دەتۆرێنێ.

**سێ بیرەوەریی کاك مەنافی کەریمی وەزیری پەروەردەی کوردستان سەبارەت بە رووداوەکانی سالی ٦٢- ١٣٢٥**

١- رۆژێک لە مالی کاک محەممەدی عەباسی کە لایەنگری دەولەتی ئێران بوو، دەگەل ژمارەیەک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی سەقز و چەند ئەفسەرێکی سوپا، دانیشتوبووین و باسمان لە بارودۆخی سەربازگەکانی دەولەتی ناوەند و پێشمەرگەی حکوومەتی کوردستان لە رێگەی سەقز- بانە دەکرد. ئاغای ئەمیر ئەسعەدی عەلیار میوانی ئاغا عەباسی لە کۆڕەکەدا بوو. نەخۆش و وەرەزو ماندوو؛ بەهۆی ئەوەی دەمێک بوو دەیناسیم پێی گوتم: دەمبینی کە نەخۆش و داماوم. ئێوە کە دەچنەوە مەهاباد؛ لەلای قازی محەممەد باسی نەخۆشییەکەم بکەن و پێی بلێن دەمهەوێ بچمەوە سەرمووچە و مەزراکانم لە دەوروبەری بۆکان و لەوێ پشوویەک بدەم. کاتێک لەسەقز تووشی قازی محەممەد بوو راسپاردەکەی ئەسعەد ئاغام پێ گەیاند، فەرموویان ئێمە دوژمنایەتیمان دەگەل کەس نییە و پێش بەگەڕانەوەی

کەسیش ناگرین. ئاغا ئەمیر ئەسعەد، بۆیان هەیە لەهەر کوێ حەزیان لێیە، بژین پاش دووڕۆژان وەڵامەکەم بە ئەمیر ئەسعد گەیاندەوە. بەڕاستی چێژم وەرگرت لەشێوەی پەیام ناردنی ئەم دووزاتە گەورەیە کە تەمەنێک دوژمنی یەکتر بوون و بە خۆم گوت: گەورە پیاوان تەنانەت لە دوژمنایەتیشدا گرانی و سەنگینی خۆیان دەپارێزن.

٢- مەئموورییەتێکم هەبوو بۆ سەردەشت، بەرپرسانی دەوڵەتی ناوەندی لە تەحویل- دانەوەی کاروباری سەردەشت بە بیانووی جۆراوجۆر خۆیان دەبوارد. بە پێی ئەو ئەزموونانەی لەو وادە و بەڵێنیە بێ بنەمایانە هەمبوو دەمزانی ئەمڕۆ ئەمڕۆی بەرپرسیانی تاران لە فێڵ و گزەبەولاوەشتێکی تر نییە. دوانیوەڕۆیەک مەئموورییەتم پێ درا کە پێویستە پێشمەرگە بۆ هێرش کردنە سەر سەردەشت ئامادە بکرێن بۆ ئەوەی بەزوویی ئەم ناوچەیە ئازاد بکرێ. کاتژمێر ٩ی شەو گەیشتینە ئاوایی "کاولان". دەگەڵ کاک مەحموودی وەلیزادە و دلشاد ڕەسوولی کە جێ وبانەکەیان بۆ لە سەربانی قاوەخانە ڕاخستبووین چووینە سەرێ پیشووبدەین هێشتا نەخەوتبووین، کاتژمێر یەکی نیوەشەوبوو کە ئوتومبیلێک لەبەردەم قاوەخانەکە ڕاوەستا و سەبارەت بە ئێمە پرسیاری لە قاوەچی کرد کە زانینی ئێمە لە سەرێین هاتە سەرێ. نێردراوی کاک سەدیق حەیدەری بوو. گوتی: سۆڤیەتییەکان بە هێرشی پێشمەرگەکەنیان بۆ سەردەشت زانیوە دەڵێن ئێمە ئەوە لەتاران خەریکین کێشەکانی کوردستان و ئازەربایجان جێ بەجێ دەکەین، بەڵام ئێوە بیانوو دەدەن بە دەست دەوڵەتی ناوەندەوە کە دەست لە کاروبارەکان وەربدا.

هەر بۆیەش هێرشەکەمان هەڵوەشاندەوە و دەگەڵ هاوڕێیان چەند رۆژێک لە ئاوایی "هەمران" لە چادری پێشمەرگەکاندا لەبەرزییەکان ماینەوە.

٣- مەئمووریەتێکیشم بۆ میاندواو پێ ئەسپێردرا. چەند رۆژێک بوو حکوومەتی ئازەربایجان میرزا رەحمەتی شافعیی دەست بەسەرکرد بوو. ئارام هەرمەنی بە دەستووری حکوومەتی ئازەربایجان گرتبوو و لە "تەقی ئاباد" لە زیندانی کردبوو دەیانگوت؛ داوای پووڵێکی زۆریان لێکردووە دیار بوو لێشیان ئەستاندبا هێشتا لەو تەشقەڵەیە نەجاتی نەدەبوو. سەعات ١٠ بانگ کرامە دەفتەری حیزب یەکێک لە پێش خزمەتەکان بەرەو دیوەکەی قازی محەممەد وە پێشم کەوت دیارە ئاگادار هەی کە کاک رەحمەت شافیعی لە میاندواو گیراوە. وادیارە ئەو ماستە بێ موونیە و دەیانهەوێ شتێکی بەسەربێنن. خێرا دەگەڵ سێ ئەندامی حیزبی وەڕێکەون و لەلایەن منەوە بە نمازعلیۆف بڵێن؛ زیندانی کردنی کوردێک لەلایەن ئازەربایجانییەکەوە ئەویش لە شارێکی وەک میاندواو کە نێوەی زیاتری خەڵکەکەی کوردن، سووکایەتییە بە ئێمە؛ ئەگەر بێتو ئەو تاوانێکیشی کردبێ، دەبێ لە مەهاباد سزابدرێ؛ هەڵبەت رای ئێمە وانییە و پێمان باشترەکە ئازادبێ.

دەگەڵ بەرێزان حاجی مستەفا داودی، حەمەدەمین شەرفی و دلشاد رەسوڵی هەباس ئاغای عەزیزیی زاوای میرزا رەحمەتی شافعی بە ئوتومبێل وەڕێ کەوتین. لەمیاندواو لەبەر دەرگای قاوەخانەیەک بۆ چاخواردنەوە دابەزین. دیتمان، سەربازێکی سۆڤیەتی هات و گوتی: فەرماندەکاری پێتە. دەگەڵ سەربازەکە

ڕۆیشتم. فەرماندە کە گوتی: میرزامەناف! بۆ هاتوونەمیاندواو؟ گوتم، بۆ لای ئێوە. ئیدی ڕاسپاردەکانی قازی محەممەدم پێ ڕاگەیاند- گوتی: بەو هاوڕێیانەت بڵێ، خێرا لە میاندواو بچنەدەرێ و لە یەکەمین قاوەخانەی سەر ڕێگا چاوەڕێت بن- بەقسەمان کرد. گەڕامەوە لای و گوتی: بە ماشێنەکەی من بچۆبولای ئارام هەرمەنی- شافیعی تان تەحویل دەداتەوە. کە گەیشتمە "تەقی ئاباد" کەوتمی سۆراغی ئارام هەرمەنی شوێنی کارەکەیان پێ نیشاندام. بۆ خۆی لەوێ نەبوو- بەڕواڵەت لە ئاغای شافیعی و لە منیش کە لەوە پێش دەماننناسی رووبینی هەبوو- فەرمانی پێدرابوو شافیعی تەحویلی من بداتەوە. پاش ٥ دەقیقە شافیعی یان هێنایە نووسینگە. لە ڕێوە سواری مانشێن بووین و هاتینە میاندواو. ماشێنی حیزب، لە میاندواو ئامادە بوو سوپاسی نمازعلیۆفمان کردو بەرەو مەهاباد وە ڕێ کەوتین. لەگەڵ هاوڕێیانیش لە یەکەم قاوەخانەی سەڕێدا یەکمانگرتەوە و ماچ و مووچ دەستی پێکرد و هەموومان بە هۆی ئەو سەرکەوتنەوە بەخۆمان دەنازێ:

### بیرەوەرییەکی حاجی قادری ئەیسلامیان- بانکداری مەهاباد.

سەرەتایی ساڵی ١٣٢٥ی.ه بوو. بۆ کڕینی "پارچە" چووبوومە تاران و لە میوانخانەی "حەقیقەت" مابوومەوە- ڕۆژێک کاک عەوڵای نەهری کە دۆستێکی لە مێژینەم بوو هاتە میوانخانە و گوتی: قازی محەممەد تەشریفی لەگراند هۆتێلە. داوای لێکردووم ئەو کوردانەی لە مێوانخانەن، بانگیان بکەم بۆ لای. کاری بە تۆیە. من و چەند کەسێک لە کاسبکارانی شارەکانی تر؛ خێرا چووینە هوتێل. کاتێک گەیشتنێ؛

جەماعەتێکی هەواڵنێری ئێرانی و بیانی لە هۆڵێک کۆبوونەوە. هوتێلەکە زۆر قەرەباڵغ بوو. پاش چەند ساتێک قازی محەممەد هاتە هۆڵەکە- چەند هەواڵنێرێک دەستیانکرد بە پرسیاران ئێمە لە سوچێکەوە وەستابووین کاتێک دەست کرا بە قسەکردن. قازی محەممەد بە هەواڵنێرەکانی گوت: من قسەیەکی ئەوتۆم نییە. ئێستا هەرلێرە ژمارەیەکی کوردی لێن کە بۆ کاری تایبەتی (شخص)ی خۆیان هاتوونەتە تاران- لە خۆیان بپرسن، بزانن چییان دەوێ؛ دەردومەرگیان چییە؟ قازی محەممەد رووی لە ئێمە کردو گوتی: بە رێزان بۆ خۆتان قسان بکەن. بڵێن چییتان دەوێ و گرفتتان چییە؟

ئێمە کە هەموومان ئەهلی بازاڕ بووین و، قەت لە کۆڕی ئاوادا بەشدار نەبووین سەرمان لێ شێوا بوو، هەر نەماندەزانی بڵێین چی. لەجێی خۆمان وشک ببووین.

قازی محەممەد بە چاوەتیژەکانیەوە رووی تێکردین و گوتی: ئەوە بۆ قسە ناکەن؟ گوتم: قوربان! لەوشوێنەی ئێوە هەن؛ ئێمە بۆمان نییە، قسە بکەین. فەرمووی؛ نا؛ تکا دەکەم حاجی قادر- بۆ خۆت قسەبکە. هەرچی حەزت لێیە بیڵێ. دەم و دەست غیرەتم وەبەر خۆم هێنا دووهەنگاو هاتمە پێشتر و گوتم: بەڕێزان گوێم لێ راگرن:

ئێمە خاوەنمان دەوێ، خاوەن. ئێمە ناوونیشانمان دەوێ. شوناسمان دەوێ قسەیەکی پێشینیان هەیە دەڵێ: بزنێکی گڕوێ لەسەت ئسکە کێوی باشتر؛ ئێوە، هەمووتان خوێندەوارن و دەزانی بێ کەسی وبێ ئەنوایی دەردێکی گرانە. دڵنیام بیستووتانە زۆر جاران لەسەر بزنێک یا تەنانەت سەگێک دوو عەشیرەت پێک وەربوون، و تێک بەربوون و چەند کەس تێدا چوون ئەوە واتای ئەمەیە ئەو

حەیوانە خاوەنی هەبووە ئی عەشیرەتێک یا کەسێک بوو. بەڵام ئێوە بچنە کوێیستانان و لە بەیانییەوە هەتا شەوێ ئەگەر دەدانە ئاسکە کێوی راو بکەن کە زۆریش لەو حەیوانانەی باسم کردن بە بایەخترن نەتەنیا کەس پێتان ناڵێ پشتی چاوتان دوو برۆیە، بەڵکو هەموو کەس دەستخۆشیتان لێ دەکا و چەپڵەتان بۆ لێدەدا. جیاوازییەکەی ئەو دووشتە لە هەبوونی خاوەن بێ خاوەنیدایە و هیچی تر.

بەرێزان! چاو لەم جلو بەرگە پۆشتەو پەرداخەی من بکەن. وردلێم بنوارن، جلوبەرگەکەم هەمووی کوردی و ئێرانیێە. پێموایە زۆر لە جلووبەرگی هیندییەکان کە بەروپشتی ئاوەڵایە؛ ماقووڵترو بە حەدەیترە. زۆریش لە شمەکی عەرەب کە عەبایەکی ناحەز و عەگاڵ و لاپێچە؛ جوانترە: لە جلوبەرگی فەرەنگییەکانیش جوانتر و نەجیبانەترە بەو هەمووە زریقەو بریقەی وێیدەخەن. بەڵام هەر لەم تارانەدا کە چەند رۆژێکە هاتووم لە پێیتەختی وڵاتەکەم بۆ شتکڕین گاڵتە و تیتاڵیم پێ کراوە و تەشەریان لێداوم. کەس ناوێرێ بە عەرەب یا هیندی یا رووسێک بڵێ پشتی چاوت دوو برۆیە. چونکە خاوەنیان هەیەو دەوڵەتەکانیان لە بچووکترین بێ حورمەتی و سوکایەتی پێ کردن دەکۆڵنەوە. بەڵام ئێمە چونکە بێ خودانین دەبێ گوێ بۆ ئەم بێ حومەتیانەی شل کەین. بەرێزان بڕوانن؛ ئەوە "بە گیان ناخێری ئێمە رەسەننترین رەگەز و تۆرەمەی ئێرانیین و واش لە راستیدا، بێ شوناسترین کەسین. ئێمە خۆمان خاوەنی دیرۆک و کلتوور و زمان ئایین و دابونەریتی کۆنی خۆمانین تاوانی ئێمە ئەوەیە بە زمانەوە بگەین بەو ئامانجەمان. ئەوەی قازی محەممەد دەیفەرموێ؛ قسەی دڵی هەموومانە؛ ئەوگەورەو حەقدارمانە"

حاجی قادر گوتی: کاتێ لە قسەکردن بوومەوە دیتم هەمووگیانم دەلەرزێ و رەسەر ئارەقە کەوتووم و سۆرانییەکانم کراو نەتەوە و ئەو شتەی بەلامەوە سەیر بوو، ئەوە بوو کە دیتم، هەموو بە شدارانم بەو قسانەم کە لە ناخمەوە هەڵدەقوڵین، هەژاندەوە لەوەش سەیرتر ئەوەیەکە لە رۆخساری نوێ زۆربەی هەواڵنێرە ئێرانییەکاندا، خەم و فرمێسکم بەدی دەکرد.

ئەو رۆژە هەستم بەوەکرد کە ئەو قسەیەی ساڵەهای ساڵە، نەتەوەیەک لە دڵیدا هەڵچنیوەو پەنگ خواردۆتەوە؛ دەرمبڕیوە. وەک بڵێی بارێکی قورسیان لەسەر شانم لابردبێ. بەچەشنێک کە لە تەواوی ژیاندا ئاوا هەستم بە هێمنی نەکردووە.

## پەراوێزەکانی پێشەوای رابوون:

١- لە پیاوانی ئایینی بەناوبانگی تەورێز کە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە بەرامبەر هێرشی رووسییەکاندا راوەستا و پاش کۆتایی شەڕ بەهۆی نالەبار بوونی وەزعی حکوومەتی ناوەند، بە دژی حکوومەت راوەستا هاوکات بەرنگاری کۆمۆنیزم بۆوە؛ دواجار بە هاتنی قایمەقامی نوێ (مخبر السلطنه) لە تەورێز کوژرا. (سەرچاوە فرهنگ معین جلد ٥ل ٤٩٠)

٢- یادداشتەکانی میرزامەنافی کەریمی.

قازی محەممەد لەسەرەتای حکوومەتی کۆماریی کوردستاندا تەمەنی ٤٦ ساڵان بوو. بە هۆی توانایی دەروونییەوە توانیبووی جگە لە زمانی فارسی زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، تورکی و رووسی فێربێ. گرنگییەکی زۆری دەدا بە مەسەلەی زانست و پەروەردەی لاوانی کورد هەر بۆیەش بۆماوەیەکی زۆر بەرپرسیارەتی دایرەی پەروەردەی مەهابادی وە ئەستۆگرت. قەڵافەتێکی لەبار و دڵگر و تیشکەڵە و ئەسمەری هەبوو. چاوی تیژ و گەشی و ردینە کورتەکەی ئەوەندەی دیکەی مەزن کردبوو. زۆربەی شەوان پاش سەعات ١ یا ٢/٣٠ی شەوێ دەیگوت: مەناف: ئەم شەو دەورێکی شار لێدەدەم. لەوەیکە ئاسایش و هێمن بەسەر شاردا زاڵبوو خۆشحاڵ دەبوو قەت خۆی پێ لە خەڵک و هاوکارەکانی گەورەتر نەبوو لە میوانی و رێورەسمە تایبەتی یەکانیاندا بەشداریی دەکرد. ئاکار

و هەڵسوکەوتی دەگەڵ خەڵک و بەتایبەتی ئەندامانی حیزب دۆستانەبوو. قەت ناوی دوژمنانی نەدەهێنا و جوامێرانە دەگەڵیان دەجووڵاوە. لە پۆشینی شمەکیش دا ئەو پەری سادەیی رەچاو دەکرد. ئیجگار لەسەر خۆو هێمن بوو. خەمخۆری هەموان بوو. خەڵکی مەهابادی لە چاویان خۆشتر دەویست بۆیەش ناز ناوی "بینایی" هەڵبژاردبوو.

٣- ئەو پردە یەکەم پردی ساوجبلاغ و لە شوێنەوارەکانی بوداق سوڵتانە و کەوتۆتە رۆژئاوای مەهاباد ئەو پردە بێ ئەوەی کۆسپێک بێ لەبەردەم دروست کردنی بەنداوەکەی مەهاباد؛ لەلایەن بەرپرسانی فاشیەوە تێکدرا.

٤- دەڵێن مەهاباد نازناوی زەردەشتی پێغەمبەری کوردە و گۆیا زەردەشت خۆی لە باشووری گۆلی ورمێ لە دایک بووە.

٥- یادداشتەکانی میرزا مەنافی کەریمی

لەو هەلومەرجە تایبەتییەی ئەوکات دا هاوپەیمانان بۆ راگواستنی تەقەمەنی و دابین کردنی پێداویستییەکانیان باشووری رۆژئاوای ئێرانیان. (پارێزگاری سنە و کرماشان و...) داگیرکردبوو حکوومەتی ئێرانیش ئەم ناوچەیەی چۆڵ کردبوو. لەو حاڵەدا دیاریکردنی سنووری کوردستان زۆر دژوار بوو. بەڵام کوردەکان لە هەموو شارەکانی کوردستاندا چالاکیان دەنواند و چالاکیی پروپاگەندەی خۆیان پەرپێدەدا و لە شارەکانی دەوروبەر بەسەرنجدان به هەژاری و کەم بوونی کات بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان و ناردنی کتێبی کوردی بۆ قوتابیان و پێک هێنانی کتێبخانەی گشتی و نوژەن کردنەوەی ئەوشوێنانەی بەهۆی شەری دووهەمی جیهانییەوە کاوڵ ببوون گەلێک هەنگاوی باش و بەکەڵک هەڵگیرا. بە هۆی بوونی هێزی دەوڵەت لەو شارانە بە تایبەت کە لە باری سیاسی و نێو

دەوڵەتییەوە بەشێک لە ئێران لە ژێر دەستی ئەمریکاو ئینگلیسی دابوو، بەشێکیش لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت(١) هەر بۆیە گۆرەپانی چالاکی یەکان بەرتەسک بوون. سەردەشت و بانە و سنە و سەقز بەدەست هێزی رژێمەوە بوون. بەو حاڵەشەوە شەپۆلی پروپاگەندەکان ئەوێشی گرتەوە و کاریگەریی بەر چاوی لەسەر ئەو ناوچانە دانا

٦- لە وتووێژێکدا کە دەگەڵ کاک رەحمان حەلْوا لە دامەزرێنەرانی ژ. ک هەمبوو؛ ئەویش لەسەر ئەو باوەرە بوو کە کاک عەبدولرەحمانی کیانییش لە دامەزرێنەرانی ژ. ک بووە.

٧- یادداشتەکانی میرزا مەنافی کەریمی

- شانۆی دایکی نیشتیمان ١٣٢٤ی.ە- ١٩٤٥ی.ز

ئێستاشی دەگەڵ دابێ نەمزانی کێ یاچ کەسانێک ئەو شانۆیەیان نووسی. ئەو جۆرەی لێرەولەوێ بیستوومە پاش تێک چوونی حکوومەتی رەزاخان ١٣٢٠ کۆمەڵێک لاوی مەهابادی لەو برە ئازادییە کەڵکیان وەرگرت و جار نەجارێک کۆ دەبوونەوە و شانۆی دایکی نیشتیمانیان بەزمانی کوردی پێشکەش دەکرد. دایکی نیشتیمان بە شێوەیەکی دڵتەزێن لە حاڵێکدا کە دەستەکانی کەلەپچەیان لێدرابوو و ئەژنۆکانی دەلەرزین و هێزی رۆیشتنیان نەبوو دەهاتە سەر "سێن" و بەشداران بە دیتنی ئەو وەزعە دڵتەزێنەی دایکی نیشتیمان دڵیان پردەبوو. بە تایبەت بە بیستنی دەنگی خەمهێنەری منداڵەکانی؛ فرمێسکیان (رێچکەیان) دەبەست. دیتنی ئەو دیمەنە دڵتەزێنە کاری دەکردە سەر هەستی بەشداران. دەقی شانۆ نامەکە لەو پێنج بەیتە (شیعرە)ی مامۆستا هەژار وەرگێرابوو:

راوکەری بەدخوو؛ خوێن رێژی خوێن خۆر ئێوەبن خودا؛ بەسە زوڵم و زۆر
لە ژێر باڵم دا رای مەپەرێنن هێلانەکەمان لێ مەروخێنن

| | |
|---|---|
| دەندووکی شووشی شووشەی گیانمە | خەت و خاڵەکەی حەزی گیانمە |
| من لە مەرگی خۆم دڵم ئێش ناکا | بەڵام دەترسم تیر و خەتاکا |
| نەدەیتە لە خۆم، رۆڵەم بەرکەوێ | جەرگم ببرێ لە شیرن خەوێ |

شاعیر چیرۆکەکە ئاوا دەگێڕێتەوە کە باڵندەیەک لەنێو لک و پۆپی دارێک دا هێلانەی چێ کردووە و لەوێدا بێ خەفەت جووجەڵەکانی بەخێودەکات. جووجەڵە وردە وردە خڕۆکە دەبن و بەسەر و گوێلاکی یەکتردا دەچنەسەر. دایکە بەهەر چەرمەسەرییەک بێ بژیوی رۆژانەیان بۆ پەیدا دەکا و ئاگای لێیانە لە نەکاو سێ چوار راوچی دێنە ئەوێ. ئەو تێدەگا راوچییەکان هەموو وڵات گەراون هەتا رێیان کەوتۆتە بن ئەو دارەی هێلانەی جووجەڵەکانی لێ یە. دایکی جووجکان ئۆقرەی لێدەبڕێ. یەکێک لە راوچییەکان سێرەی لێدەگرێ دایکە بە چاوی فرمێسکاوی بە راوچی دەڵێ؛ ئەی راوچیی خوێن رێژ دەزانم هاتوون بۆ راوی ئێمە. دەستمان لێهەڵگرن. ئێمە لەو سووچەی دارستاندا هێلانەمان چێ کردووە. جووجەڵە خوشەویستەکانم لەژێرباڵمدا خەوتوون. ئەو هێلانەیەمان لێ کاول مەکەن بە خوێنی دڵ سازمان کردووە. دەنووکی سووری جووجەڵەکانم شووشەی تەمەنمن. خەت و خاڵی باڵەکانیان ئۆخژنی ژنان و گیانمن. من لە مەرگی خۆم ناترسم. دەترسم تیرتان سەربکا و جووڵەکانەم بپێکێ- لەو خەوە شیرنە "بێ بەشیان مەکەن" ئەوەی رۆڵی دایک دەگێڕێ (ئەکتەر) عەولای نەهری بوو کە ساڵی ١٣٦٠ی.ە کۆچی دوایی کرد. ئەو لە جلو بەرگی دایکانە بە دەنگێکی زوڵاڵ و بە هەوایەکی خەمناک و غەریب ئەم شێعرانەی بۆ راوچیان دەخوێندەوە و دەگریا. کاک عوبەیدیللای ئەیووبیان و سیروس حەبیبی رۆڵی منداڵەکانیان لە ئەستۆ بوو. تەمەنیان ١٣ و ١٤ ساڵانە بوو-

سیروس حەبیبی مێر منداڵێکی ژیکەڵە بوو کە بە دەنکە هەست بزوێنەکەی بیسەرانی دەهەژاند شمەکێکی لە وێنەی پەپوولە لە بەردا بوو، دەستە چووکە و ژیکەڵەکانی بەرەو ئاسمان هەڵدێنا و ئەو شێعرەی حاجی قادری کۆیی دەخوێندەوە (ئەی بێ نەزیر و هاوتا هەرتۆی کە بێ قەراری بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری) بەگفت و لفتێکی منداڵانە و دلێرانە داوای لە خودا دەکرد کە دایکیان رزگار بکا. کرو زانەوەی منداڵانەی ئەوەندە خەمناک بوو کە دڵی بەردی دەتواندەوە.بەشێکی زۆری سەیرکەران (وەگریان دەکەوتن.) دەگریان شانۆکە لە حەوشەی خانووبەر یەکدا بەرێوە دەچوو بۆیەش دەرو جیرانانیش لە دیتنی بێ بەش نەدەبوون ژنان و کچان کە لە سەربانانەوە ئەم دیمەنانەیان چاو لێدەکرد خۆیان بۆانەدەگیرا و لە کڵپەی گریانیان دەدا. هەرکەس دیتبای دڵی پڕ دەبوو. منداڵانی دایکی نیشتیمان دەچوونە بن پیلی و هەڵیاندەستاندە سەرپێ و منداڵانە دەیانلاواندەوە و ماچیان دەکرد و دڵخۆشییان دەداوە بۆ وەی بە غیرەت و پشتگەرمیی ئەوانەوە دایکی نیشتیمان لە چنگی راوچییان رزگاری بێ. ئەو شانۆیە لە شارەکانی نەغەدە و شنۆ و بۆکانیش نمایش کراو دەگەڵ پێشوازیی گەرمی خەڵک رووبەروو بۆوە.

٨- یادداشتەکانی میرزامەنانی کەریمی

لە رۆژی ٢٨ی بەفرانبارەوە واتە ٣ی رۆژ بەر لە ٢ی رێبەندانی ١٣٢٥ ژمارەیەکی زۆری خەڵکی شارەکانی کوردستان پێکهاتوو لە عەشیرەت و هۆزی جۆراوجۆر و دێهاتی؛ لەدوور و نزیکەوە؛ بەو تووش و سەرمایەوە خڵەتە و بەوپەری دڵپاکییەوە وردە وردە هاتنە مەهاباد. نیشتیمانپەروەری وای لەو خەڵکە تاسەبارە کردبوو کە پەلەپەلی زوو گەیشتنیان بوو. هەر دەستە و تایەفە و هۆز و عەشیرەتێک

بەرووگەشییەوە؛ ئاڵا بەدەست و بەدەنگی دەهۆڵ و زورنا لەپێش سوار و پیادەوە بە دروشمی بژی کورد و کوردستان؛ هاتنی خۆیان رادەگەیاند. خەڵکی مەهابادیش بەو پەری دڵئاواییەوە بە پێشوازییانەوە چوون و میوانداریتیان کردن. رۆژی ٢ی رێبەندان گەیشت. ئەگەرچی چەند رۆژ پێشتر بەفرێکی قورس باریبوو هەوایەکی تووش و هەور و هەڵابوو؛ بەڵام ئەو رۆژە تاو و بانێکی خۆشی بوو؛ تیشکی خۆر دیمەنێکی تایبەتی بە دەشت و کێوان بەخشیبوو. وەک بڵێی سروشتیش هاتبێتە یارمەتیی خەڵک. شەقام و سەردەرانەی دەرگای دایرەکان و ماڵان بە ئاڵا رازابوونەوە. دەنگی گۆرانیی رەسەنی کوردی لە کوچە و کۆڵانانەوە دەهات و ئۆخژنی بە دڵی تاسەباران دەبەخشی. لە کاتژمێر ٨ بەولاوە جەماوەر هەر زیادی دەکرد. لەلایەکی گۆرەپانی چوار چرا؛ قوتابیانی کور و کچ بە جلوبەرگی یەکرەنگەوە بەرێز وەستابوون و شاد و سەرخۆش، گۆرانی سروودی دڵبزوێنیان دەگوتەوە. لە بەرامبەری شوێنی ئاخافتنەوە؛ هەزاران کەس خەڵکی شار و دێهاتەکانی موکریان بە جلوبەرگی رەنگاورەنگی کوردییەوە راوەستابوون.

٩- یادداشتەکانی میرزا مەنافی کەریمی

١- ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی لە ناوچە جۆراجۆرەکانەوە هاتبوونە ئەم کۆبوونەوەیە بریتی بوون لە:

٢- ماکۆ و ئارارات: ئاغای عومەر خانی جەلالی، شێخ حەسن، شێخ کەی- حەسەن دەلایی- عەبدڵڵامیلان فەخری

٣- سۆمای برادۆست و دەشتی مەرگەوەر: ئاغای سەید عەبدوڵای گەیلانی زادە؛ عومەر خانی شەریفی، عیرفانی شەریفی- تاهیر خانی سمکۆی هەباس فێنک- قۆیتاس ئاغا- شێرۆ محەممەدی، حاجی وەتمانی

عەبدی، حەسەنی نیلو- تەمەر خان- مورادنورکۆ- حەسەن هەنارە-زوبەید- عوزید- سەید سەعید فەهیم.

٤- شنۆ: ئاغایان؛ مووساخانی زەرزا- قەرەنی ئاغای زەرزا- میرزا سەعید- قازی محەممەدی خزری- کاک هەمزە

٥- سولدوز! ئەحمەد کاک خدر- قاسم پیرۆتی- حەمەدەمین پیرۆتی

٦- لاجان: کاک عەوڵا قادری- مامەند پیرۆتی- حوسێن محەممەدی-پیرۆت ئەمیر عەشایری هەمزەی نەڵۆسی.

٧- پیرانشار: حەمەدەمین ئاغا- قەرەنی ئاغا.

٨-میاندواو: حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی .

٩- بۆکان: عەبدلرەحمانی شەرەفکەندی- رەشید عەلیزادە

١٠- عەشیرەتی مەنگوڕ: کاک برایمی ئەدهەم- مام حوسێنی ئاغان-کاک سلێمان- کاک هەمزە- حەمەدەمین ئاغای سەلیم ئۆجاق

١١- عەشیرەتی هەرکی: رەشید بەگی بەگزادە- نووری بەگ و زێروبەگ

١٢- هۆزی گەورکی سەقز: حەمەد ئاغا- برایم ئاغا

١٣- گەورکی سەردەشت: کاک ئەسەد ئاغا

١٤- دێبوکریی شار وێران: جەعفەر کەریمی- قارەمان محەممەدی.

١٥- دێبوکریی بۆکان: ئاغای ئیلخانی زادە- محەممەدی- عەیز ئاغای کولتەپە- ساداتی هیدایەتیی حاجی کەند

١٦- فەیزوڵلا بەگیی بۆکان و سەقز: محەممەدی فەیزوڵلا بەگی-عەلیخانی شێرزاد- ئەحمەد خانی فارووقی- عەولاخان- حەسەن خانی فەیزوڵلا بەگی.

١٧- سەقز: عەلیخانی فاتح- محەممەد خانی ئەحمەد خان شێخی- شێخ سەعیدی ئەسعەدیاری- رەسوول ئاغای مەحموودی- عەلی جەوانمەردی- حەمە رەشید خانی قادری قادری خانزادە.

١٨- عەشیرەتی جوانرۆ- ئۆرمان و بارزانی.

١٩- شێخەکانی کولیجە بە سەرکردایەتیی شێخ حەسەنی شێخی بورهان.

١٠- یادداشتەکانی میرزا مەنافی کەریمی:

ئەوانەی دوای قسەکانی قازی محەممەد لە بواری خەبات و خۆراگری نەتەوەی کوردەوە قسەیان کرد و ئامادەیی خۆیان بۆ هەر چەشنە فیداکارییەک دەربری بریتی بوون لە:

١- حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی

٢- مەلا حوسێنی مەجدی

٣- حاجی بابە شێخ.

٤- عەبدلرحمانی شەرەفکەندی (هەژار)

٥- حەمەدەمین شێخولئیسلامی (هێمن)

٦- سەید محەممەدی ئەیوبیان

٧- شێخ حەسەنی شێخی بورهان

٨- عومەر خانی شکاک

٩- زێرۆ بەگ

١٠- حەمەدەمین موعینی

١١- سەید عەبدولعەزیزی گەیلانی زادە

١٢- برایم ئەدهەمی مەنگور

١٣- ئەحمەدی ئیلخانی زادە

١٤- محەممەدی نانەوازادە

ئافرتان:
١٦- وەیلمەی سەیادیان
١٧- خەدیجە حەیدەری

لە کۆتاییدا قوتابیانی قوتابخانەی گەلاوێژ و سەعادەت سروودی نیشتیمانییان خوێندەوە

١١- یادداشتەکانی میرزا مەنافی کەریمی:

## هەڵکرانی ئاڵای کوردستان لە نەغەدە.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکرات بریاری‌دا ئاڵای سێ رەنگی کوردستان لە نەغەدە هەڵکرێ. رۆژی ١٣٢٤/٩/٢٧ی.ە کاک حوسێنی فروهەر- عەلی خوسرەوی- حەمەدەمین شەریفی- دڵشاد رەسوولی و وەهاب بلووریان سەعات٨ی بەیانی گەیشتنە نەغەدە و لەلایەن ئاغایان؛

پیرۆتی: کاک بایز- میرزا برایمی سەرۆکی شارەوانیی نەغەدە و توێژە جۆراوجۆرەکانی ئەم شارەوە پێشوازییان لێ کرا. شەقام لە جەماوەر جمەی دەهات و نزیک بە حەوسەت پێشمەرگە لە پیادە رۆکانەوە بە مەودایەکی دیاریکراو بەرێز وەستابوون. کاتژمێر ٩/٣٠ی بەیانی لە حاڵێکدا کە شادمانی شاری نەغەدەی لە ئامێز گرتبوو هەموو خەڵکیش بە کورد و تورک و ئەرمەنی و و ئاشوورییەوە بەشدار بوون؛ قوتابیانی کور و کچیش دیمەنێکی رازاوە تریان خولقاندبوو؛ ئاڵا هەڵگران بەرەو شوێنی دیاریکراو چوون- لە حاڵێکدا کە ئاڵاکەیان دەشەکاندەوە، چەکدارانی حیزب هەزار فیشەکیان بە نیشانەی شادمانی تەقاند. ئاڵاکە لەبەر دەرگای وە ژوورکەوتنی حیزب خرایە سەرشانی پێشمەرگەیەک و خەڵکێکی زۆر زیارەتیان کرد. دواتر کاک عەلی خوسرەوی بە تێروتەسەلی باسی رۆڵی

شەهیدانی کرد. دوایی بەرێز تەقی خانی بۆزچلوو کە یەکێک بوو لە گەورەکانی هۆزی قەرەپەیاغ چووە شوێنی ئاخافتن و لەلایەن عەشیرەتەکەیەوە بەخێرهاتنی شاندی میوانی کرد و شادمانی خۆی بە نیسبەت دامەزرانی لقی حیزبی دێموکرات لە نەغەدە دەربڕی، رێورەسمەکە بە کوشتنەوەی چەند مانگا و مەڕ و پاشان بەشادمانی کۆتایی پێ هات.

## هەڵکرانی ئاڵا لە مەهاباد.

رۆژی ١٣٢٤/١٠/٥ی.ە ژمارەیەک لە ئەندامانی حیزب مەئموورکران کە لە رێورەسمی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە بۆکان بەشدار بن ئەوانە بریتی بوون لە؛ بەرێزان؛ مستەفا سوڵتانیان- عەبدولقادر مودەریسی- حوسێن فروهەر- حەمەدەمین شورەفی- عەلی خوسرەوی- مەحموود وەلێزادە- رەحیم لەشکری- مامۆستا هێمن و محەممەدی نانەوازادە فەرماندەی ئەرتەشی کوردستان و قاسم ئاغای ئیلخانی زادە- شاندی بەرێکراو کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ لەمەهاباد وەرێکەوت و سەعات ٢ی گەیشتە میاندواو ژمارەیەک لە پیاوماقوڵانی بۆکان وەک بەرێزان؛ حەمەدەمین ئیلخانیزادە- برایمی عەلی یار- ئەبوبەکری موهتەدی- مامۆستا حەقیقی و مامۆستا هەژار هاتنە پێشوازیی شاندەکە- لە دوو کیلۆ مەتریی میاندواو لە ئاواییەک کە تەغیاباتی (تقی ڕباد)ی پێ دەڵێن و زۆربەی خەڵکەکەی ئەرمەنین لەلایەن عیشقی خانی ئەرمەنییەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێکرا. ژنان و پیاوانی ئەرمەنی کە ئەم بەرئەوبەری جادەکەیان گرتبوو بە قریوە و چەپلە لێدان بەرێیان کردن. لەسەر رێی میاندواو بۆکان ئاواییەکی گەورەی بە ناوی "قەرەمووسالیان"

لێ یە- بنکەیەکی حیزبی دێموکرات لەوێش کرابۆوە. ئەندامانی حیزبی ئەم ئاواییەش کە بریتی بوون لە بەرێزان؛ مستەفا موقتەدیری- یۆنس خان- مەحموود خان- عەولا خانی ئەمیری؛ بەگەرمی پێشوازییان لە شاندەکە کرد و بەپێی داب و نەریتی باو مەرێکیان کوشتەوە. سەعات چواری عەسر شاندەکە گەیشتە عەلیاوا لە دوو کیلۆمەتریی بۆکان (ئێستا تێکەڵ بوون وەرگێڕ) لەو ئاواییەش پیاو ماقووڵانی گوند: جەعفەر ئاغا و مارف ئاغای ئیلخانزادە- ئەحمەد بەگی فەیزوڵلا بەگی- هەباس ئاغا- خالید ئاغای حیسامی- فەیزوڵلاخان- عەلی خانی قازڵیان- عەلی بەگی فەیزوڵلا بەگی عومەر ئاغا و ئەحمەد ئاغا و کەریم ئاغای عەباسی بە کوشتنەوەی چەند "گا" و مەرێک پێشوازییان لێکردن. کاتژمێر ١٢ی ڕۆژی دوایی حاجی بابە شێخ سەرۆکی هەیئەتی میللی کوردستان دەگەڵ ئەحمەد ئاغای ئیلخانیزادە هاتنە بۆکان. ڕۆژی ١٣٢٧/١٠/٧ی.ه کاتژمێر٨ی بەیانی لەسەر قەڵای بۆکان کە دەڕوانێتە شار ڕێورەسمی هەڵکردنی ئاڵا بەڕێوە چوو. مارشی نیزامیی لێدرا و خەڵکی بۆکان کە نزیک بە ٦ هەزار کەس دەبوون لە خوار قەڵاوە لە دەوری حەوزە گەورە کردیان بە ڕەشەڵەک. لەگەڵ هەوای شادمانی ئاڵا هەڵگری نیزامی ئاڵاکەی شەکاندەوە و لە حاڵێکدا کە جەنابی حاجی بابەشێخ و عەلی بەگی شێرزاد لەلای داستی لە و بەرێزان حەسەنی قزڵجی و حەمە سادقی قزلجی و علی خوسرەوی و جەعفەر ئاغا و مارف ئاغای ئیلخانیزادە و خالیدی حیسامی و حوسێن ئاغای عەلیار و براکانی لای چەپی ئاڵاکەیان گرتبوو؛ ئاڵای "پیرۆز" لەنێو چەپڵە ڕێزان و مارشی نیزامیدا هەڵکرا.

لە پاشان مامۆستا هەژار و سادقی قزلجی بە ڕێکووپێکی قسەیان لەسەر گرینگێتی و ڕێزگرتن لە ئاڵای کوردستان کرد و مامۆستا هەژار و

حەقیقیی شاعیر هەرکام بە نۆرەی خۆیان شێعری نیشتیمان پەروەرییان خوێندەوە و کاتژمێر ١ی دوای نیوەرۆ رێورەسمەکە کۆتایی پێ هات.

١٢- یادداشتەکانی میرزا مەناف کەریمی

ئەوە یەکەم جار بوو ئافرەتی کورد دەهاتنە نێو گۆرەپانی چالاکیی کۆمەڵایەتییەوە و هەلیان بۆ رەخسا کە مافی لە دەست چووی خۆیان وەرگرنەوە و شوناس و رۆڵی خویان لە بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا دیاری بکەن. بەپێی برگەی ٢١ی پێرەوی حیزبی دێموکرات کە دەڵآ؛ ژنانیش وەک پیاوان دەبێ خاوەنی تەواوی مافە سیاسی- کۆمەڵایەتی و مەدەنی خۆیان بن، کۆمیتەیەک بەنێوی کۆمیتەی ژنان دامەزرا و بەرپرسیارەتیەکەشی کەوتە ئەستۆی میناخانمی هاوسەری قازی محەممەد. روون و ئاشکرایە بەهۆی ئەو سەرکوت و بێ بەشیانەی رێژیمی رەزاخانی پەهلەوی سەبارەت بە خوێندنی گەنجان و منداڵانی کوردستاندا پێکی هێناوبوو ژمارەی ژنانی خوێندەواری کوردستان لە چاو نەخوێندەوارەکانی ئێجگار کەم بوو. بەو حاڵەشەوە بەهۆی هۆگرییەک کە ژنان بە حکوومەتی کوردستان هەیانبوو؛ هەر لەگەڵ ئاگادارکرانەوەی کۆمیتەی خۆیان تێدا ناونووس کرد ژنان گەلێک گروپ و دەستە بە عەشق و تاسەوە ناونووسیان تێدا کرد. لە لایەن وەزارەتی فەرهەنگ (رۆشنبیریی کوردستانەوە) بێجگە لە قوتابخانەکەی کچان؛ قوتابخانەیەکی دیکەش هەر بۆ کچان کرایەوە. لەبەر ئەوەی کە ژمارەیەک ژن لەم بوارەدا گەلێک فیداکارییان کرد و چالاکییان نواند پێویستە ناوی هێندێک لەو خزمەتگوزارە بەرێزانە بێنم بۆ ئەوەی ناویان لە مێژووی فەرهەنگ و کولتووری ئەم نیشتیمانەدا هەربمێنێتەوە.

١- خاتوو مینا قازی- بەرپرس ٢- خاتوو ئامینە داودی ٣- خاتوو زیبا ئەیوبیان مەرکەزی ٤- شا سوڵتان خانمی قازی فەتاحی قازی ٥- خاتوو رەعنا فروهەر ٦- کولسوم سوڵتانیان ٧- نەزاکەت حاجی رەشید

٨- خەدیجە حەیدەری ٩- وەجیهە شوجاعی ١٠- وەیلمە سەیادییان

---

ئەو ئافرەتانەی بە نووسینی وتار و بابەت دا هاوکاریی رۆژنامەی کوردستانیان دەکرد.

١- کوبرا عەزیمی ٢- حەلەب ئیسماعیل فەرەجی.

---

هەروەها ئەو ژنانەی لە جێژن و رێورەسمەکاندا قسەیان دەکرد؛

١- خاتوو سەلتەنەت داودزاد ٢- عیشرەت عەزیمی ٣- وەیلمە سەیادییان ٤- خەدیجە حەیدەری

٥- ئێران بلووری ٦- فەریدە زەندی

١٣- یادداشتەکانی میرزا مەناف کەریمی.

هەروەها لە شاری مەهاباددا کەسایەتیەکی کەلیمی کە نزیک بە ٦٠ بنەماڵە دەبوون. دەژیان. جوولەکەکانی مەهاباد بەپێچەوانەی جوولەکەی شوێنەکانی تری ئێران لەو پەری هێمنایەتی بە دوور لە چەرمەسەریدا دەژیان و خەریکی کاری زێرینگەری- پارچە فرۆشی (بەزازی) و دەرمان فرۆشی بوون- کەس کاری بە سەریانەوە نەبوو. لەکاتی راگەیاندنی کۆماردا ئەوانیش وەک خەڵکی مەهاباد بەشداری جێژن و شادمانی بوون- وەزارەتی رۆشنبیری (فەرهەنگ) کە خەریکی رێک و پێک کردنی کاری قوتابخانە و کتێبی قوتابیان و کاروباری لەم چەشنە بوو؛ جوولەکەکانیشی وەپشت گوێ نەخست- لە راگەیەندراوێکدا ئیزنی پێدان

کە بەپێی بۆچوونی قازی محەممەد کەلیمیەکانیش وەک برا کوردەکانی دیکەیان؛ مافی ئەوەیان هەیە قوتابخانەی تایبەت بە خویان هەبێ و خوێندنی زمانی عیبریش ئازادە و قوتابخانەکانیشیان وەک قوتابخانەکانی دیکەی کوردستان لە هەموو ئیمکاناتی یاسایی بەهرەمەندن. پاش ئەم راگەیاندنە؛ رێککەوتن کە قوتابخانەیەکیان بەسەرپەرشتیاری ئاغای داود زادە سازکەن دایرکرانی ئەم قوتابخانەیەش پێشوازیی لێکرا و بە ئامادەبوونی دایک و باوکانی قوتابیان رێورەسمی کردنەوەی بە شادمانییەوە بە رێوەچوو.

-١٤

١- زۆر کەس پێیان وایە شەهید نانەوازادە لە پیلانێکدا لە فرۆکەوە هەڵداشتراوەتە خوارێ و فرۆکە بەرنەبۆتەوە.

١٥- ژێر نووس- نووسراوەکانی میرزامەناف کەریمی.

حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان هەر حیزبی توودە بوو کە بە کەمێک گۆرانکاری لەبەرنامە و پەیرەوی نێو خۆی

- بەپێی هەل و مەرجی ئەوکات- بەبێ سەرنج دان بەوەی کە چالاکی خۆی لە ناو خاکی ئێران دا دەست پێ کردووە، بە پەلەپەل لە ئازەربایجان دەستیان کرد بە بەرێوەبردنی ئەو کارانەی وا کۆمۆنیستەکان لە سەرەتای شۆرشی مەزنی ١٩١٧ی. ز لە سۆڤیەت کردبوویان.

زەوی و زاری خاوەن زەوییەکانیان داگیر کرد و لە نێو وەزیران دا، دابەشیان کرد. ئەو کارخانانەی وا خاوەنی تایبەتیان بوو ماهی حکوومەت بوو لە دەست کەسایەتییە ناسراوەکان دابوون. وەک سامانی نەتەوەیی راگەیەندران و بەکرێکاران سپێردران. باجی زۆر قورسیان بەسەر دەوڵەمەند و کاسبکارەکان دا فەرزکرد و موڵک وماڵی کەسایەتییە

ناسراوەکانیان داگیرکرد. لەئاکامی ئەم کارانەدا، ئازەربایجانی ئێران کەسی چالاک و کارامەی تێدا نەما. لەراستیدا تەورێز مابۆوە و خەڵکێکی بێ روح و بێ هەست. شەقامەکان چۆڵ و هۆڵ بوون و لە جموجۆڵ کەوتبوون. دووکانەکان هیچ کەلوپەلیان تێدا نەمابوو و بێ مشتەری و بێڕەونەق مابوون. سەرکردەکان ئاگایان لە بارودۆخی ئابووری ناچەی ژێردەسەلاتیان نەبوو و لەجێی ئەوەی بیر لە ئاسایش و خۆشگوزەرانی خەڵکەکەیان بکەنەوە، هەموو حەولیان بۆ یەک گرتنەوەی دوو ئازەربایجان بوو.

١٦- ژێر نووس- نووسراوەکانی میرزا مەناف کەریمی.

قازی محەممەد بە ئەندامانی حیزبی گوت: ئەگەرچی دەزانم ڕێگای تێپەرین و چوونم بۆ سۆڤیەت کراوەیە و جادەکانی ئازەربایجانی رۆژئاوا هە لە ژێر چاودێری خۆمان دایە، بەڵام چۆن پەنا بۆ دوڵەتێک بەرم کە پابەندی هیچ کام لە پەیمانەکانی نییە و بۆ بەرژەوەندی خۆی بە هۆی هێندێک قەوڵ و پەیمانی بێ بنەما- کە لەلایەن دوژمنانەوە پێی دراوە و جگە لە درۆ و فێڵ هیچی تر نییە- نەتەوەکانی کورد و ئازەر کردۆتە قوربانی ویستەکانی خۆی و هەروا بەجێی هێشتوون.

من حکوومەتی سۆڤییەتم تاقی کردەوە و دیسان تاقی کردنەوەی خەتایە. ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران ئازادن کە بۆهەر جێێک کە دەیانهەوێ برۆن و هەرچی پێویستیانە هەڵیگرن و نەهێڵن چرای ئەم بزووتنەوەیە خامۆش بێ.

١٧- ژێر نووس- نووسراوەکانی میرزا مەناف کەریمی.

ئەورۆژەی کە دادگایی پێداچوونەوە دەستی پێرد، هەشتا رۆژ لە دادگایی کردنی قازییەکان تێپەر ببوو، کە لە دادگایەکی سەرەتایی سەحرایی‌دا حوکمی مردنیان پێ درابوو. بۆ دادگایی پێداچوونەوە.

وەفدێکی ئەفسەرانی دادگای تەورێز- کە چواردەکەس بوون- هاتنە مهاباد. قازی محەممەد لە دوایین بەرگری کردنی خۆیدا کە چل و هەشت سەعات درێژەی هەبوو، لە هۆڵی دادگا گوتی: بزانن کە لە پاش کوژرانی من، هەر دڵۆپە خوێنێکی من، ئەبێتە قازی محەممەدێکی تر و ئەو بزاڤە قەت خامۆش نابێ.

-١٨

١- کتێبی دادگایی کردن و بەرگرییەکانی قازی محەممەد- نووسینی محەممەد ئەمین و بەدرەدین سالح وەرگێرانی ئەحمەد محەممەدی-

لەزمانی سەروان کیومەرس سالح، هەواڵنێری سوپا شا، هەموو بابەتەکانی دادگا و دەقی وەسییەت نامەکە لەژمارە ٦٦ و ٧٥ی گۆڤاری (تاج کیانی) دا چاپ بووە و سەروانی ناو براو بەهۆی بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتانە، دەرەجەی لێ ئەستینراوە و ساڵێک خراوەتە زیندان.

سەروان کیوومەرس خوشکەزای سەرلەشکەر جەم بووە. سەرلەشکەرجەم، مێردی (شەمس)ی خوشکی شا بووە. ئەو بابەتانەی بە شێوەی نهێنی و پاریزراو (محرمانە) بۆ شای ئێران و فەرماندەکانی ئەرتەش ناردووە.

١٩- ژێر نووس- نووسراوەکانی میرزا مەناف کەریمی

ئەو رۆژە کە بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی کوردستان بە من سپێردرا، دەمزانی کە لە داهاتوودا بۆ بەرێوە بردنی ئەو ئەرکانەی پێیان سپاردووم، لەگەڵ گرفتی زۆر سەخت رووبەروو دەبم. لە خەرمانانی ١٣٢٠ تا ساڵی ١٣٢٤ هەموو قوتابخانەکان داخراوو یا نیوە داخراو بوون. بارودۆخی بیناکان و پەروەردەی مناڵان لە هەموو لایەنێکەوە خراپ و بێ سەروبەر و ئاڵۆز بوو. بۆ فێرکاری زمانی کوردی نەکتێبمان هەبوو

نە مامۆستا. لەلایەکی تر، زووتر کردنەوەی قوتابخانەکان لە هەموو لایەکەوە (فشارمان) لەسەر بوو.

هێچ رێگایەکمان نەبوو جگە لەوەی لە کوردستانی عێراقەوە کتێبی کوردی بێنین. بە بریاری شاندی فەرهەنگی بە زووترین کات، کتێبی پێویستمان هێنا و دوای گۆرانکاری پێویست، لە چاپخانەی مهاباد چاپ و ئامادەکرا و کتێبی تازە لە نێوان قوتابخانەکان و کتێبخانە گشتییەکانی شاردا دابەش کران. هاوکات لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەکان، چەند مامۆستای کوردستانی عێراق کە ناویان:

عوسمان دانەش، محەممەد وەردی، عەبدلقادر ئەحمەد و جەمیل بەهائەدین بوو، بەویستی خۆیان بۆ فێرکاری زمانی کوردی، هاتن بۆ مهاباد. قوتابخانەکان کرانەوە و منداڵان بە شەوق و زەوقێکی چاوەروان نەکراو روویان لە (پۆلەکان) کرد. بەهۆی هۆگری لە رادە بە دەریان، لە ماەوی کەمتر لە مانگێک دا ئەلفبێی کوردی و تارادەیەکیش خوێندنەوە و نووسین فێر بوون و بەو پێیە گرفتێک کە لە سەرەتادا بەبێ چارەسەری دەهاتە بەرچاو بە ئاسانی چارەسەرکرا.

چوارمانگ بەسەر تەمەنی حکوومەتی کوردستان دا تێپەری و لەو ماوەیەدا، کەم و کوورییە فەرهەنگییەکان تارادەیەک چارەسەرکران بەڵام بەرێوەبردنی قوتابخانەکان، ئەگەرچی حەولێکی زۆری بۆ درابوو، بەڵام پێویستی بە تێکۆشانی زۆرتر هەبوو. بۆ ئەوەی کارەکان بەرسەریەکدا نەکەوێ و کۆسپ نەکەوێتە سەررێگای پێشکەوتنی کاری فەرهەنگی، کاک ئیبراهیم نادری کە لاوێکی خوێندەواری کرماشانی و بەکالۆریۆسی لە ئەدەبیاتی فارسی هەبووە بوو. لەلایەن منەوە کرابە جێگر لە کاروباری

فەرهەنگی کوردستان. ئەو بەڕێزە لاوێکی زۆرچالاک و لە بەڕیوەبردنی کارەکانی دا زۆر جیددی بوو.

لەهەموو کاتەکانی شەووڕۆژدا، لە ڕاگەیشتن بە پێداویستیەکانی قوتابخانەکان خافل نەبوو و ئەرکەکانی خۆی زۆر بە باشی بەڕێوە دەبرد و من بە ئاسوودەیی کارەکانی حیزبیم بەڕێوە دەبرد.